پێناسە: ـــــــــــــــــــــــــــ

ناو: سیخورمە

نووسەر: سمایل قاسمی

وێنەی رووبەرگ: شۆڕش ئاهی

پیتچن: نیک‌خوو

## نێوەرۆک

# تەنز

تەنز کە وشەیەکی عارەبییە، لە فەرهەنگدا بە مانای تانە و تەشەرە و بە یەکێك لە شێوازەکانی دەربڕینی مەبەست دەگوترێ، کە وێژەر بە زمانێکی شیرن و بزاوی، بە مەبەستی چاکسازی، لە پەردەدا بابەتێك دەخاتە بەر رەخنە. ئەگەرچی زۆر جار پێکەنینی تەنز، بزەیەکی تاڵە و بە واتایەکیتر، کوڵی گریانە و نووسەر یا وێژەر، بەرگی پێکەنینی لەبەر دەکا.

کەواتە تەنز، نە بە تەنیێ گاڵتە و جەفەنگە و نە تەوس و تانە، هەرچەند وشەی «تەوس» لە بابەت بێژ و ماناوە زۆر شێوەی «تەنز» دەدا و وێدەچێ گۆڕاوی وشەی تەنز بێ و لە زمان خوێندەوارە عارەبیزانەکانەوە کاتی خۆی ئاوەکیی زمانی کوردی بووبێ و لە باری بێژکردنەوە ئەو ئاڵوگۆڕەی بە خۆیەوە دیبێ.

جیاوازیی تەنز لەگەڵ گاڵتە ئەوەیە کە گاڵتە، تەنیا بۆ بزەی لێوە و ئامانجێکیتری نیە" بەڵام تەنز لەگەڵ بزە و پێکەنین، ئامانجی چاکسازیی تێدا و تەنیا بۆ پێکەنینی رووت نیە. فەرقی تەنز و فرِیش لەوەدایە کە فرِهاویشتن بە پێچەوانەی تەنز، قسەی سووك و نێو و نیتکە لێهەڵدانی لایەنی بەرباسە بۆ سووکایەتی پێکردن، بەڵام تەنز تەنیا رەخنە لە کردەوە چەوت و دزێوەکان دەگرێ و کەسایەتیی لایەن دەپارێزێ. هەروەها جیاوازیی تەنز لەگەڵ تەوس و تانە، لەوەدایە کە تەوس و تانە، لۆمە و ئیرادێکی رەق و قیناویە، کەچی تەنز هەر وەکوو گوتمان، بە زمانێکی شیرن و بزاوی رەخنە دەگرێ و گەندەڵییەکان لە پەردەدا دەس نیشان دەکا و لەو رەخنانەشدا، ئامانجی چاکسازیە، نەك شکاندنی لایەنی بەر رەخنە و بەس. بە قەولی یەکێك لە تەنزنووسە فارسەکانی سەردەم: «تەنز لە خەو راپەڕاندنی نوستووە بە پەلکی گوڵ، نەك بە چۆماغ».

جێی ئاماژەیە کە تەنز و گاڵتە و تەوس، گەلێ جار ئەوەندە لێك نزیك دەبنەوە و تێکەڵ دەبن کە کێشانی سنوورێك لە نێوانیاندا، کارێکی دژوارە و لێك هەڵاواردنیان ئەستەمە. کە ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەو راستیە، کە ئەو بابەتانەش وەك زۆربەی باسە زەینیەکانیتر، رێژەیین و پێوەری ناسینیان لەلای کەسانێکی بە بیروبڕوا و فەرهەنگی جیاوازەوە، یەك نیە. هەڵبەت بۆ دیاری کردنی ژانری دەقێك، دەبێ نووسراوەکە بە خڕوپتوونی لە بەر چاو بگیرێ نەك بەتەنێ کۆپلە یا بەشێکی هەڵبڕاو لە دەق.

دیارە تەنزیش وەك دیاردەکانیتری وێژە، هەڵقوڵاوی بیر و هزری ئەو کۆمەڵەیە، کە تێیدا سەرهەڵدەدا و بە واتایەکیتر ریشەی تەنز لە فەرهەنگ و دابونەریتی کۆمەڵ دایە. هەر بۆیەشە تەنزی دوو کۆمەڵی لێك دوور لە باری فەرهەنگیەوە، جیاوازیی بنەڕەتیان هەیە و ئەو کۆمەڵگایانەی کولتووریان لەگەڵمان جیاوازە، تام و چێژێکی ئەوتۆ لە تەنزەکانیان ناکەین و کەمتر وەبەر دڵمان دەکەون. چون لە دوو کولتووری جیادا عورف و عادەت و گەلێ جار بایەخەکانیش هاوبەش نین و تەنانەت هەڵدەکەوێ بایەخەکان دژ بە یەکتریش بن" یانی ئەوەی لە کۆمەڵگایەکدا بایەخە، لەویتردا وەك دژەبایەخ سەیر دەکرێ.

بۆ وێنە ئەگەر کابرایەکی سکاتلەندی چیرۆکێکی کوردی بخوێنێتەوە کە کابرایەك لە قاوەخانەدا خۆی دەخافڵێنێ تا لە بەرامبەر هەواڵێکیدا دەست بۆ گیرفانی نەبا، رەنگە وەك تەنزێك چێژی لێنەکا. چون دابونەریتی وان لەو جێگایەدا، لەگەڵ ئێمە جیاوازە.

دیسان ئەوەش جیا لەو بەشانەی تەنزە کە لەسەر بناغەی وێژە و فۆلکلۆری زمانی سەرەکی، یان تەنانەت لەسەر رێنووسی زمانەکە پێکدێن و بە قەولی کوتەنی: بۆ وەرگێڕان مل نادەن. کە ئەو بەشانە تەنیا لەو زمانەدا باری تەنزیان هەیە کە پێی نووسراون و لە وەرگێڕاندا، محاڵە تەنزەکەیان بمێنێ، مەگەر زمانی دووهەم زۆر لە زمانی هەوەڵ نزیك بێ و ئەو وشە و رستانەی تەنزەکەیان لێسازکراوە لە هەر دوو زماندا هاوبەش بن" کە ئەوەش کەم هەڵدەکەوێ.

بۆ وێنه“ مامۆستا حەقیقیی ڕەحمەتی گێڕاویێتەوە کە: «ماوەیەك بوو بەدوای قەباڵەیەکی ملکیدا دەچوومە مەحکەمەی قازی عەلی (باوکی پێشەوا) و قەباڵەکە نەدەدۆزرایەوە. تا ڕۆژێك پێشەوای ڕەحمەتی هەواڵی قەباڵەکەی لە باوکی پرسی و قازی عەلی گوتی: هەر لێیدەگەڕێم و نایبینمەوە. پێشەوا فەرمووی: بابە! دەبێ بۆی بگەڕێی، نابێ لێی بگەڕێی!»

دیارە لە کوردیدا «لێگەڕان» بە دوو مانای «بەدوواگەڕان» و «وەپشتگوێخستن»، ئیهامە و ماناکانیشی دژبەیەکن. بەڵام بارتەقای ئەو وشەیە لە زمانێکیتردا ئەو تایبەتمەندیانەی نیە.

※※※

شێوازی تەنز زیاتر ئەو بابەتانە دەگرێتە خۆی کە دەسەڵات یان دابونەریت ئیزنی دەربڕینی ڕاستەوخۆیان پێنادا و تەنزنووس لە پەردەدا، ناڕاستەوخۆ دەیاندرکێنێ و لە تەنگەژەدا، ڕێی دەرباز بوون بۆ خۆی دێڵێتەوە. هەر بۆیە ئەو کۆمەڵگایانەی لە باری داب و نەریتەوە بەربەستترن، بەو مانایەی کە عەیب و عار و ڕووبینی لە واندا پترە، مەیدانی تەنزنووسیان ئاوەڵاترە (وەکوو وڵاتانی خاوەن فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتی). هەروەها لەو وڵاتانەی ئازادیی دەربڕینی بیروڕا کەمە، تەنزنووس دەتوانێ بەشێك لەو بابەتانەی جەغزی سووریان لە دەورکێشراوە، وەك هەوێنی تەنزەکانی بەکاریان بێنێ و لە پەردەدا بیانخاتە بەر ڕەخنە و تەنزی بە تامیان لێ بخولقێنێ. کە ئەو دەرەتانە بۆ تەنزنووسی وڵاتە ئازادەکان کەمتر دەست دەدا (تەنزی سیاسی).

لە کوردەواریدا بەو پێیەی کە کۆمەڵگاکەمان لادێیی بووە و تەنانەت لەوەپێش شارەکانیشمان زۆربەیان جەماوەریان بە ڕادەیەك نەبووە کە خەڵکەکەی یەکتر نەناسن، داب و نەریتی پڕشەرم و ڕوودەربایەسی بەسەریدا زاڵە و دیارە لە هەڵس و کەوت لەگەڵ ناسیاودا شەرم و ڕووبینی پترە“ کە ئەو شەرم و ڕووبینیە بۆتە هۆی ئەوەی خەڵك لە ڕوویان هەڵنەیە بەعزە بابەت و ڕەخنەیەك ڕاستەوخۆ دەربڕن، بەڵکوو

لە پەردەدا بیاندرکێنن. هەر بۆیە ئەگەر لەبەر باو نەبوونی پەخشان نووسین بە زمانی کوردی، تەنزی نووسراومان کەمە، بەڵام نەزیلە و پەند و مەسەلی تەنزاویمان لە وێژەی زارەکیدا زۆرە، کە ناڕاستەوخۆ و لە پەردەدا مەبەست دەدرکێنن. بۆ وێنە:

*« کەری پێنج قڕانی هەر جاشکی دوو ریاڵیی دەبێ!*

*بە هەڵوا هەڵوا، دەم شیرن نابێ!*

*رێوی بۆ خۆی لە کونەوە نەدەچوو، هەژگەڵێکیشی لە کلکی دەبەست!*

*هەرکەس کەر بێ، ئێمە کورتانین! و...»*

***

وێدەچێ پێشینەی مێژوویی شێوازی تەنز، چی وا لە شێوازی ئاسایی کەمتر نەبێ. چون شاعیران و نووسەرانی رابردوو بەگشتی ئەگەر بابەتی سەربەخۆشیان بە تەنز نەگوتبێ، کەمتر وایە لە شوێنەوارە ئاساییەکانیاندا بۆ زاخاوی مێشك و بزەی لێو، رەگەی تەنزیان تێناویشتبێ. بەڵام دەکرێ بڵێین شێوازی تەنز، چ لە رابردوو و چ لەو سەردەمەدا، لە بەراوەرد لەگەڵ شێوازی ئاسایی، بارستایەکی کەمتری لە نووسراوەکان (چ شیعر و چ پەخشان) بۆ خۆی تەرخان کردووە، کە ئەو رێژەیە هەر تایبەت بە زمانێکیش نیە و لە هەموو زمانەکاندا کە بەراوەردی بکەین، بە هێندێك کەم و زیادەوە هەر بەم جۆرەیە. دیارە هۆیەکانیشی دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە شێوازی ئاسایی بۆ دەربڕینی هەموو مەبەستێك دەبێ. بەڵام هەموو بابەتێك ناخرێتە چوارچێوەی تەنزەوە. بۆ وێنە چەمکێکی زانستی لەگەڵ شێوازی تەنز ناگونجێ یاخود بابەتێکی پیرۆز، یان کۆستێکی گەورە، لێدوانیان بە تەنز ناڕەوایە، مەگەر بە وردبینیەوە پیرۆزیی بابەتەکە نەژاکێنرێ و لە کۆستەکانیشدا رەخنە بەرەو ڕووی هۆکارەکان بکرێتەوە. دوامینی ئەوانەش تەنزنووسین تایبەتمەندیی خۆی هەیە و هەموو ئەو کەسانەی بە شێوازی ئاسایی دەنووسن، رەنگە نەتوانن لە شێوازی تەنزدا وەك نووسراوە ئاساییەکانیان سەرکەوتوو بن.

دیارە ئێستا شێوازی تەنز، چ لە باری خوێنەر و چ لە باری نووسینەوە لە بەراوەرد لەگەڵ رابردوو، بەرەو گەشەسەندنە. کە یەکێك لە هۆیەکانی ئەو گەشەیە،

وەك هەموو لایەنەكانی تری وێژە، زۆربوونی خوێندەوارە. ئێستا كە بە پێچەوانەی رابردوو، زۆربەی خەڵك خوێندەوارە" هەر بەو پێیەش سروشتیە لایەنگری تەنز چ بۆ نووسین و چ وەك خوێنەر لە رابردوو زیاتر بێ. هەروەها بەدیهاتنی تەنزی رۆژنامەیی یەكێكیتر لە هۆكارەكانی پەرەگرتنی ئەو شێوازەیە، چون لە رابردوودا لەبەر نەبوونی رۆژنامە و گۆڤار، ئەو تەنزە زارەكیانەی كە لەسەر هەواڵەكانی رۆژانە ساز دەبوون، دەرەتانی بلاوبوونەوەیان نەبوو و سەردەمیان بەسەردەچوو و هەر لەو ناوچەیەی لە دایك دەبوون، دەمردن و نەدەنووسرانەوە. بەڵام ئێستا بەهۆی لەدەست دابوونی رۆژنامە، ئەو تەنزانە، كە بارستاشیان كەم نیە، دەنووسرێنەوە و بلاودەبنەوە.

هەڵبەت ئەگەر شێوازی تەنز، هەروەكوو گوتمان لە بەراوەرد دەگەڵ شێوازی ئاسایی‌دا بەربەستە و ئەو پانتایی و ئاوەڵاییەی شێوازی ئاسایی نیە" بەڵام لە هەمبەر ئەو بەربەستیەدا خاوەنی چەند خاڵێكی تایبەتە كە لە سەرووی شێوازی ئاساییەوە جێی دەكاتەوە. ئەو خاڵانەش ئەوانەن:

١ـ مانەوەی پتر لە زەین‌دا:

تەنز كە بە زمانێكی شیرن و پێكەنینی دەگوترێ، پتر لە زەین‌دا دەمێنێتەوە و تەنانەت زۆرجار خەڵك بابەتە تەنزەكان وەك نوكتەیەك بۆ یەكتر دەگێڕنەوە. كە ئەو شیرنی و پەرەپێدانە لە شێوازی ئاسایی‌دا نیە.

٢ـ پێخۆر بە وەختەوە:

زۆربەی چوارچێوەكانی تەنز كورت دادەرێژرێن و نیازێكی ئەوتۆیان بە پێشەكی و درێژدادڕی نیە. گەلێ جار تەنزنووس بە رستەیەك یان دێڕەشیعرێك مەبەستی خۆی بە باشی دەردەبڕێ و كاتی خوێنەری سەرقاڵی ئەو سەردەمە كەمتر دەگرێ و بەو جۆرە دەست بە وەختەوە دەگیرێ.

**٣ـماندوو نەکردن:**

چون شێوازی تەنز پێکەنینیە و وەك شێوازی ئاسایی وشك نیە. خوێنەر نە تـەنیا لـە خوێندنـەوەی مانـدوو نـابێ، بـەڵکوو خوێندنـەوەی تـەنز وەك حەسـانەوەیەك لـە نووسراوە ئاساییەکان سەیر دەکا.

**٤ـ کاریگەریی پتر:**

چون تەنز لەگـەڵ گاڵتـە و پێکـەنین تێکەڵـە و راسـتەوخۆ و زەق رەخنـە نـاگرێ، لایـەنی بـەر رەخنـە کـەمتر لێـی هەڵدەبەزێتـەوە و لادەگـرێ و، هاسـانتر رەخنـەکان دەسەلمێنێ.

**٥ـ دەرەتانی تایبەت:**

هەرچەند تەنز لە بابەت پانتای باسەکاندا لە شێوازی ئاسایی بەرتەسکترە، بەڵام بەعزە بابەتێکی سیاسی و تەنانەت کولتووریش هەن، کە لە زۆر کۆمەڵدا بە زمـانی ئاسایی باس کردنیان باسی سەرە و تەنیا بە زمانی تەنز و لە پەردەدا دەرەتانی بـاس کردنیان هەیە و دەکرێ بخرێنە بەر رەخنە.

❊ ❊ ❊

# شێوە و ئامرازەکانی تەنز

شێوازی تەنز بەگشتی لەسەر بناغەی گۆڕینی عادەت و باو پێکدێ و بە چەندین شێوە و کەرەسەی جۆراوجۆر دادەڕێژرێ، کە لە کورتە تەنزەکاندا زۆرجار تەنیا کەرەسەیەك کیفایەت دەکا" بەڵام بۆ داڕشتنی تەنزە دوور و درێژەکان، وەك چیرۆك و رۆمان، کەرەسەی زیاتر پێویستە و تا تەنزنووس لە بابەتەکەیدا کەرەسەیەکی پتری لەکار کردبێ، تەنزەکەی پتەوتر دەبێ.

*هەڵبەت جێی ئاماژەیە کە ئەگەر بابەتێك رەخنەی بە ئومێدی چاکسازی لە پشتەوە نەبێ، بەو کەرەسانەوە لە خانەی تەنزدا جێ ناگرێ و بە گاڵتەیەکی شاراوە، یان تانە و تەشەری رووت دەژمێردرێ.*

ئەو شێوە و کەرەسانەی کە بۆ داڕشتنی تەنز بەکاردەبرێن، دووبەشن: بەشێکیان لەگەڵ ئەو زمانەی پێی نووسراون یان وێژە و فۆلکلۆرەکەی راستەوخۆ پێوەندیان هەیە و لە وەرگێڕاندا باری تەنزیان دەفەوتێ، کە ژمارەشیان کەم نیە، هەر بۆیە تەنزنووس تا لە وێژە و فۆلکلۆری زمانەکەی ئاگادارتر بێ، لە کارەکانیدا سەرکەوتووترە.

بەشەکەیتر، ئەو شێوە و کەرەسانەن کە راستەوخۆ لەگەڵ زمان و وێژە پێوەندیان نیە و لە وەرگێڕاندا بە پێچەوانەی بەشی هەوەڵ، باری تەنزیان کەمتر دەفەوتێ. مەگەر دابونەریت و بایەخەکانی ناوەرۆکی تەنزەکە، لە زمانی دووهەمدا لەگەڵ زمانی هەوەڵ جیاواز بێ.

**ئەلف)** ئەو شێوە و ئامرازانەی پێوەندیی راستەوخۆیان لە گەڵ زمان و وێژەدا هەیە:

١ـ لاسایی: (Parody)

لەو شێوەیەدا تەنزنووس لە چوارچێوەی شیعر، پەخشانی بەنێوبانگ، بەیت و گۆرانی یان هەر بابەتێکی وێژە و فۆلکلۆریی ناسراویتر، تەنانەت قالبە عورفیەکانی

وەك نامــە و ئاگــاداری، کــەڵك وەردەگــرێ و مەبەســتی خــۆی لــە یــەکێك لــەو چوارچێوانەدا دادەڕێژێ و چون چوارچێوەکە بۆ خوێنەر ئاشنایە و بە ناوەرۆکێکیترەوە لەگـەڵی راهـاتووە، ئـەو نێوئاخنـە تازەیـە، نائاسـایی دەنـوێنێ و تـەنزێکی شـیرنی لێدەردەچێ (لە لاسایی شیعردا کێش و قافیە دەپارێزرێ). بۆ وێنە:

ئەلف) شیعر:

*«جۆگەلەی خوێنە لەناو دیدەیی گریانمدا*

*زۆر لـە مێـژە نیـە هیـچ ئانـە لـە گیـرفانـمدا*

*من کە دەموت نیە شۆخێ کە دڵم برفێنێ*

*گۆشت بزن هات و بە جارێ سەر و سامانمدا...»*

کە مامۆستا هێدی لاسای ئەو غەزەلەی نالیی کردۆتەوە:

*«جۆشش و تابە لەنێو دیدەیی گریانمدا*

*چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی تۆفانمدا...»*

ب) بەیت: سەحەر خـانم کـە گۆشـت قازەکـەی لـە سـەهۆڵداندا لەبـەر هـەڵبڕانی ناوادەی کارەبا، بۆگەن بووە، لەسەر کێش و قالبی بەیتی سـوارۆ، ئـاوا بـە قازەکـەی هەڵدەڵێ:

*«... دەوەرە قازۆ بەشقی خودا و رەسووڵان*

*سووکە سەفەرێکت لەبەرە بۆ نێو یەخچاڵێ*

*رەبی قازی من بە دوور بی لە تەشەنێ*

*لە کووژانەوەی فریزەرێ*

*لە توانەوەی سەهۆڵی دەبەدەنێ ...»*

(سروە ژمارە، ١٩، قازۆ، ئەحمەد قازی)

ج) گۆرانی: وەك ئەو گۆرانیانەی لە بەرنامە تەنزەکاندا لەسەر قالب و ئاهـەنگی ئـاوازە کوردێکـان دادەنـرێن. بـەڵام ناوەرۆکیـان دەگـۆڕن (ئـەو بڕگەیـە ئەگـەر بـۆ مەبەستێکی بەرزی مرۆڤایەتی نەبێ، زەرەدی پترە لە قازانج)

**٢ـ هێنانەوەی پەند و مەسەل و شیعرە بەنێوبانگەکان:**

پەند و مەسەل و شیعرە ناسراوەکان، ئامرازگەلێکی‌ترن کە تەنزنووس دەتوانێ راستەوخۆ، یان بە دەسکاریەکی کەمەوە، لەجێی خۆیدا بیانهێنێ و مەبەستی بەوان دەربڕێ. هەڵبەت ئەو بڕگەیە زیاتر بۆ تەنزی زارەکی یان تیزتێگرتن بەکاردەبرێ.

ئەلف) شیعر (بێدەسکاری): بۆ بەرێ کردنی دەسەڵاتدارێکی هەقکوژ، کە خەڵك و خوا لە دەستی بە زاڵە بوون، دەکرێ بەو بەیتەی نالی داخی لەسەر دڵ دانێی:

*«هەرچەندە کە عومری خزر و جامی جەمت بوو*

*چونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو»*

ب) شیعر (بە دەسکاریەوە): بۆ کەسێك کە بەرژەوەندی جەماوەر لەپێناو قازانجی خۆیدا لە ژێر پێ دەنێ، ئەو شیعرەی مامۆستا هێمن دەپێکێ:

*«چ سپڵەن ئەو کەسانەی گورگەمێشن*

*کەلاك بۆ گورگی برسی رادەکێشن»*

ج) پەند و مەسەل: بۆ دەسەڵاتدارێکی کە لە هەوەڵی کارەوە خەڵکی لە خەرکەمان ناوە، بەڵام بۆ فریودان قەیسی هەڵدەرێژێ، ئەو پەندە جێدەگرێ:

*«ساڵی خۆش بە بەهاری را دیارە».*

**٣ـ قسەی دووسەر:**

لە کارکردنی قسەی دووسەر، شێوەیەکی‌ترە کە تەنزنووس بە کاری دەبا و قسەیەك وا دەکا دوو مانای هەبێ" یەکی روون و ئاسایی و ئەوی‌تر ون و هەڵگری باری رەخنە. ئامرازەکانیشی بریتین لە:ئیهام، شێوە ئیهام، کینایە.

ئەلف) ئیهام: تەنزنووس لە نووسراوەکەیدا وشەیەك بەکاردێنێ کە لەو جێگەیەدا دوو مانای جیاواز دەگەیەنێ و یەکیان ئاسایی و ئەویتر هەڵگری رەخنە و تەنزە. بۆ وێنە:

*«فەرق لە مابەین روبی خۆماڵی و روبی کابان:*

*ـ روبی خۆماڵی: ساڵێ جارێك لە ماڵان دروست دەكرێ، دەچێ لە كووپەڵە و دەفر و ئامانەوە و هەست و خوستی نامێنێ.*

*ـ روبی كابان: بە قاعیدە هەموو مانگان لایەكی مەهاباد سوور هەڵدەگێرێ و چ وڵاتی ناهێڵێ)).*

(سروە، ژ ١٨٠، فەرق لە مابەین، ئەحمەدی قازی)

ب) شێوە ئیهام: لە شێوە ئیهامدا، وشەی مەبەست لەو جێگایەدا دوو مانای نیە. یان باشترە بڵێین مانای داخوازی تەنزنووسی نیە. بەڵام تەنزنووس لە بارودۆخێكدا ئەو رستە یان شیعرە دێنێ، كەوشەكە بە هاسانی هەڵگری مانای داخوازی بێ. بۆ وێنە:

*پوورە بەهار بە سوێند و ئایەت نەیهێشتووە كاكە حەمەی برازای بڕوا و بۆ نانی نیوەڕۆش بە هەموو دەمایە خۆی، تەشریفی لەپێش داناوە. كاكە حەمەش بەو شیعرەی نالی تەوسی داوێتێ و دەڵێ:*

*((تەشریفی نەوبەهارە كە دنیا دەكا نوێ*

*دڵ چونكە میسلی خونچەیە بۆیە دەپشكوێ))*

دیارە لەو شیعرەدا (تەشریف) بە مانای گەورەكردن (هاتن) و خەڵاتە، نەك تێكوشین" بەڵام لێرەدا تێكوشینەكەی پوورە بەهارە و بەس.

یان: *دەڵێن كابرایەكی حوكوومەتی تاقمێك خوێندكاری سەركۆنە دەكرد كە ئێوە هەمووتان دژی شۆڕشن. یەكیان وەڵامی داوە، قوربان وا مەفەرموو، ئەزقەزا هەموومان خوازیاری شۆڕشین!*

ج) كینایە: كینایە، رستە، یان دەستەواژەیەكە بە دوو مانا" یەكی ئاشكرا و یەكی ون. هەر بۆیە وەك ئامرازێك لە تەنزدا بۆ مانا شاراوەكە لەكار دەكرێ و لە كاتی پێویستدا بۆ هاشا دەبێ. بۆ وێنە:

*كابرایەكی ئاژاوەچی دەیگێڕاوە كە شەوێك لەگەڵ رەفیقێكی لە رێدا بوون و باران تەڕی كردوون، ئەویش لە پەسیوێك ئاوری كردۆتەوە تا وشك بنەوە. لەو وەختەدا*

*یەکێك لە حازران هەڵی دایە: جا قوربان تۆش بۆ خۆت لە ئاورکردنەوەدا وەستای.*(ئاورکردنەوە بە مانای ئاور هەڵکردن، کینایەیە بۆ ئاژاوەگێڕان).

٤ـ شێوە کینایە: لێرەدا ئەو ئامرازەی بۆ تەنز بەکاردێ، کینایە نیە، بەڵکوو نیوەی پەند و مەسەل، یان شیعرێکی مەشهوورە کە زۆربەی خەڵك بیستوویانە و بە وتنی نیوەی وتەکە، نیوەکەی‌تری کە هەڵگری تەوس و رەخنەیە، دێتە بەر زەین. بۆ وێنە:

*لە کۆڕێکدا کە باسی خەم و نارەحەتی بوو، دەوڵەمەندێکی لەخۆڕازی دەیگوت: ئەمڕۆ هیچ کارێك نیە بە پووڵ نەکرێ و ئەمن بە پێچەوانەی ئێوە هیچ خەمێکم نیە. یەکێك لە حازران گوتی:«در این دنیا کسی بی‌غم نباشد» (لەو دنیایەدا کەس بێ‌خەم نیە) و کابرای لەخۆڕازی بێ‌دەنگ بوو.*چون ئەوە میسراعی هەوەڵی بەیتێکی مەشهوورە کە بۆتە مەسەل و میسراعی دووهەمی ئەوەیە:

*«اگر باشد، بنی آدم نباشد!»* ( ئەگەرکوو هەبێ، بنیادەم نیە).

٥ـ شێوە ئاخافتنی تیپێکی تایبەت:

تەنزنووس دەتوانێ بۆ دەربڕینی مەبەستی، لە شێوە ئاخافتنی تیپە ناسراوەکانی کۆمەڵ، وەکوو" عارەبی‌زانەکان، فەرەنگی‌زانەکان، پەتی‌نووسەکان و پڕوپێرێژنان کەڵك وەردەگرێ و بە لاساکردنەوەیان باری تەنز بدا بە نووسراوەکەی.بۆ وێنە:

ئەلف) پڕو پیرێژنان: *کچەکێ بابانم وێران نەبوو، ئەو کوڕەیان بە چ مەرەدێ برد. رەبی گوللەی گەرمیان بۆ نازڵ بێ. رەبی بە تیری نەبەدێوە بن، ئەیەڕۆ لەو کافرستانیە.*

ب) عارەبی‌زانەکان: *مەعقوول نیە حوقووقی قاتیبەی شەعب لە تەریق جەرائیدەوە ئیهمال کرێ.*

یان ئەو نوکتە مەشهوورەی کە مەلایەك تووشی شوانێکی شمشاڵژەن دەبێ و لێی‌دەپرسێ:

*«یا راعی! ئەم سەوتە حەزینە کە لەو نەیەوە ساتیعە، بە تەحرێکی ئەسابیعە یان هەر خیلقەتێکی جیبیللیە؟!»*

ج) فەرهەنگیزانەکان: *لە سیستمێکی تووتالیتەردا کە ئالتەرناتیڤێک بۆ ئەنیستیتۆکان کۆنکرێت نەکراوە... .*

(هەڵبەت شێوەی برگەی ﴿ب و ج﴾، بێجگەلە تەنزی ناوەرۆك، تانەیەکیشن لە نووسین و ئاخافتنی ئەو تیپانە کە وتەکانیان هێندەی وشەی قەڵەمی و نامۆی بێگانە تێدایە، کەمکەس بەباشی لێیان حاڵی دەبێ).

**٦ـ غەڵەت نووسین:**

غەڵەت نووسین، کەرەسەیەکیتری تەنزە، بەو شێوەیە کە تەنزنووس بە ئانقەست وشەیەك غەڵەت دەنووسێ، یان خود زاراوە، یا رستەی نادروست لە نووسراوەکەی دەخا، یان رستەکان لەسەر شێواز و رێزمانی زمانێکیتر دادەرێژێ و بەو کارەی تانە لەو کەسانەدا دەدا کە نووسراوەکانیان ئەو غەڵەتانەی تێدایە. زۆرجاریش تەنزنووس ئەو هەڵانە چەندین جار دووپات دەکاتەوە تا چاك لە چاو بدەن و شوێنی پێویست لەسەر خۆێنەر دانێن. هەڵبەت واباشترە نووسەر لە پەنا ئەو هەڵە ئانقەستانەدا، نیشانەی سەرسوورمان (!) دانێ تا باش بناسرێنەوە و خوێنەری ناشی چەواشە نەکەن. بۆ وێنە:

*« ئەگەر مسوڵمانەکان تام و مانای ژیانیان زانیبا، بەرەو یەکیەتی و هاوپشتی روویان دەنا!»*

یانێ“ *هەر چوار وڵاتان! بەشەڕ لەگەڵ ئێراق هەڵسان!*

**٧ـ ئاماژە بە چیرۆك و بەسەرهاتە مەشهوورەکان:**

تەنزنووس دەتوانێ وەك ئامرازێك لەو چیرۆك و بەسەرهاتانە کەڵك وەرگرێ کە لە نێو خەڵكدا ناسراون و خوێنەران بە لانی زۆرەوە بیستوویانە. بەو شێوەیە کە

دەقی چیرۆك و بەسەرهاتەكە ناگێڕێتەوە، بەڵام بە ئاماژەیەكی كورت، چیرۆك و بەسەرهاتەكە وەبیر خوێنەر دێنێتەوە و لە پەردەدا، خوێنەر لە مەبەستی دەگەیەنێ. بۆ وێنە:

*«خەڵكەكەش نەیانئەتوانی مورشیدزادەكانیان بە درۆ بخەنەوە، ناچار بوون بڕوا بە ﴿لێكلە هەڵآدانی﴾ هەردوو لایان بكەن و وردە وردە تێگەیشتن ئەمە بناغەی بۆشە و (كێشە لەسەر لێفەی مەلایە)».*

(نووشتەكەی ئامینەخان، پێكەنینی گەدا، حەسەنی قزڵجی)

٨ـ كایە بە وشە و رستە:

كایە بە وشە و رستە، كەرەسەیەكی‌تری تەنزە. كە تەنزنووس بە ئاڵوگۆڕی پیتی وشەیەك، گۆڕینی جەختی سەر بڕگەكانی وشە، لەكار كردنی جیناس بە تایبەت جیناسی لێكدراو، یان گۆڕینی وشەی رستەیەك یاخود راوەستان لە جێگایەكی رستەدا، مەبەستی دەدركێنێ و بزە دەخاتەسەر لێو. بەڵام ئەگەر ئەو ئامرازە هونەرمەندانە بەكار نەیە یان زێدەڕەویی تێدا بكرێ، تەنزەكە لۆس دەكا و دەیكاتە گاڵتەجارێكی بێ‌تام.بۆ وێنە:

ئەلف) وشە:« *فەرق لە مابەین روبی خۆماڵی و روبی كابان*

*روبی خۆماڵی: لە گەوجەفەرەنگی دروست دەكرێ كە بە كوردی دەبێتە باینجانی سوور.*

*روبی كابان: لە گەوجە فەرهەنگی دروست دەكرێ كە بە كوردی نابێتە باینجانی سوور.»*

(سروە، ژ ١٨٠،فەرق لە مابەین، ئەحمەدی قازی)

ب) رستە: *لە كۆڕێكدا، كابرایەك كە گلەیی هاتبۆوەسەر، پاكانەی دەكرد و دەیگوت: تۆ خودا ساڵی پار خراپەیەكتان بە منەوە دیوە؟ هاوكارێكی لە وەڵامدا گوتی: پار، نا.( كە بە راوەستان لە بەینی وشەی «پار» و «نا» و جەخت لە سەر وشەی پار، گەیاندی كە ئەوساڵ بەڵێ خراپەمان پێوە دیوی).*

### ٩- شێوە خوازەی شاراوە:

لێرەدا تەنزنووس بە ئانقەست وشەیەك كە تەوس و تانەی بۆ لایەنی بەرباس پێوەیە، لە شیعر یان پەند و وتەیەكی مەشهوور، دەگۆڕێ یان لایدەبا. بەڵام بیسەران بەلانی زۆرەوە وشە سەرەكیەكە دەناسنەوە و لە زەینی خۆیاندا ساغی دەكەنەوە. بۆ وێنە:

*لە كۆڕێكی سەرەخۆشیدا، كابرایەكی حەیابەخۆ كە لە پەنا سۆبەكەوە دانیشتبوو، دوای تاوێك هەستا رۆیی و یەكی بێچاو و ڕووی دمەوەر، كە دیار بوو لەگەڵ كابرای گۆڕین ناكۆكیی هەیە، گوتی: فڵانە كەس هەر من دەبینێ، خۆ ناگرێ و دەڕوا، ئەوە لە ترسی من لە بن ئەو سۆبەیە خزیبوو! كابرایەكی نوكتەباز لە كۆڕەكەدا گوتی: بەڵێ قوربان! جا سەیر ئەوەیە لە ترسی تۆ پەنای بۆ ئاور بردوو.(كە بەپێی مەسەلی «لەترسی مار پەنا بۆ ئاور بردن» كابرای دمەوەر بە «مار» دانرا).*

### ١٠- پللاری كوێری:

ئەو شێوەیە لە چیرۆك و چەلەحانێدا بەكاردێ. بەوجۆرەی كە كەسایەتیی هەوەڵ، شتێك دەڵێ كە ئیهام یان كینایەیە، بەڵام بەرامبەرەكەی بە مانایەكیتر غەیری مەبەستی كابرای لێحاڵی دەبێ و وەڵام دەداتەوە. كە ئەو لێكتێنەگەیشتنە، پێكەنینیە و تەنزی لێساز دەبێ. بۆ وێنە:

*«سۆفی نامیق: یا شێخ كە واسە، بێژە (تۆ فەرموو، ئێمە میاو)*

*مەلا جەلال ویستی سۆفی نامیق تێبگەیێنێ لە رووی شێخدا قسەی وا نەكا گوتی: سۆفی نامیق، ئەمە مانای چی؟ سۆفی نامیق لەبەر پەرۆشی و پەژارەی خۆی تێنەگەیشت مەلا جەلال مەبەستی چیە.*

*گوتی: «ساڵێك لە سەقز میوانی لالۆ هەواس بووم. شەو خێزانەكەی سینیی بۆ هاوردین، گۆشتاوی لێنابوو.نانمان تێوڵی. كتكەبۆر دەستی كرد بە میاو میاو. خاوەن ماڵەكە ئەوەندەی پارووی بۆ هاویشت، كتكەبۆر قۆستیەوە و وازی لە میاو*

*میاو نەدێنا و نەیهێشت نانەکەمان بخۆین. لالۆ هەواس سینیەکەی هەڵگرت و نایە بەردەمی کتکەبۆر و گوتی: ((کە واسە، تۆ فەرموو، ئێمە میاو!)).*
(خەملێ پەموو، پێکەنینی گەدا، حەسەنی قزڵجی)

**ب)** ئەو شێوە و کەرسانەی پێوەندیی راستەوخۆیان لەگەڵ زمان و وێژەدا نیە:

١ـ زەقکردنەوە:

زەقکردنەوە یەکێك لە ئامرازەکانی تەنزە، کە وێدەچێ لە هەموان پتر لەکار کرێ.بەو جۆرەی کە تەنزنووس ئەو لایەنانەی رەخنەیان لەسەرە، گەورە و بەرچاو دەکاتەوە و لە دەسنیشان کردنیاندا زێدەڕەوی دەکا و بە قەولی کوتەنی لە کایەك کێوێك ساز دەکا. بۆ وێنە:

*((بایەگانی دادگوستەری، پەروەندەیەکی لە پێش دانام تەماشای کەم. زۆرم سەروبن کرد سەرەدەرم لێنەکرد. پیتەکانی زۆرتر وە بزمار دەچوون کە لە تەنیشت یەك ریز کرابن و هێندێکیان کەوتبن. کابرای بایەگان کوتی:ئەم پەروەندەیە لە زەمانی هەخامەنیشیەکانەوە ماوەتەوە و تا ئێستا هەر درێژەی هەیە.))*
(سروە ژ ٨ ، پەروەندە، ئەحمەدی قازی)

٢ـ درێژدادڕی و خۆ بواردن لە باسی سەرەکی:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس بە ئانقەست بە لاڕێدا دەڕوا و دوای هەرچەند رستەیەك، بابەتێکیتر لەواندا دەکاتە دەزمایە و باسەکە درێژە دەدا و تەیر و توور لێكدەداتەوە، بەڵام ئەوەی باسی نەکا مەبەستی دیاریکراوە. بۆ وێنە:

*مام حەسەن کێ بوو؟*

*ئەو مام حەسەنە خەڵکی دێیەکی لای دارستان بوو" ئەو دارستانەی لای سەردەشت، کە دارمازوو و بەڕووە. ئاخر ئەو بەڕووەی لەوێ رەعەمەڵ دێ" بەڕێی وڵاتانی دەرەوە دەکرێ" گوایە بۆ دەرمان لە کاری دەکەن، جا باسی دەرمان کرا، بە*

*خودای کاك مامەندێك لەو گوندەی ئێمە بوو، هەر لەو گیا و گژەی لای خۆمان دەرمانی دەگرتەوە، هەمووی یەکاویەك بوو، بە رەحمەت بێ، ئەویش مرد و کورەکانی ئێستا... (باسەکە هەروا درێژە دەدرێ و تا دێ لە «مام حەسەن» دوور دەکەوێتەوە).*

### ٣- جێگۆڕکێ:

جێگۆڕکێ، یەکێکیتر لە کەرەسەکانی تەنزە کە بە گۆڕینی جێی بایەخێك، عورفێك یان بابەتێك پێكدێ و ئەو جێگۆڕینە دەبێتە هەوێنی تەنز و پێکەنین. بۆ وێنە:

ئەلف) بایەخ: *«گرووهبان رەزایی:ئەوەی دەمێنێتەوە بێ ئێوە نایخۆم، بەلام لە حەوتوویەكدا ئەوە ﴿ئەستاندنی دوو سەتمەن بەرتیل﴾ دەکرێ؟*

*حسێن قولی (ژاندارم): بۆچی ناکرێ؟ چار نیە، ئێمە کە بووینەتە پیاوی دەولەت دەبێ زەحمەت بکێشین».*

(قورئان خوێندن لە جیاتی پارەی بەرتیل، پێکەنینیگەدا، حەسەنی قزلجی)

ب) بابەت: *«شاشی هەر دەرسێکی دەیخوێند، حەوتوویەك دووپاتی دەکردەوە تا فێری بێ. حەوتوویەك ئەو دەرسەی دووپات دەکردەوە کە: «**قال الشیخ: جلد الکلب لا یصلحە الدباغة**» دوای حەوتوویەك کە چووە لای مامۆستاکەی، گوتی: ئەو دەرسە بڵێ. تا ئەگەر فێری بووبی، دەرسێکی ترت پێ بڵێم. گوتی: «**قال الکلب: جلد الشیخ لا یصلحە الدباغة**».*

(رسالەی دلگشا، کلیات عبید زاکانی)

ج) عورف: *«هەواڵنێر: سادراتی ناوچەی ئێوە چیە؟*

*هاوولاتی: ورکەنان، کەوشەکۆن، روحەشکاو.»*

(وتو وێژی کاریکاتۆرێکی برایانی قورەیشی)

### ٤ـ تاریفی بەراوەژوو:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس بە زمانێك ئیراد لە لایەنی بەر رەخنە دەگرێ، کە لە پێشدا پێمان وایە تاریفی دەکا. چون ئەو شێوەیەی رەخنەی پێدەگرێ، شێوەی تاریفە، نەك رەخنە. بۆ وێنە:

*قسەیەکی مەشهوورە دەڵێن: «خودا هەڵناگرێ نەمدیوە نوێژان بکا، بەڵام دیومە رۆژوان بخوا!»*

### ٥ـ خۆ هەتڵە کردن:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس خۆگێل دەکا و کەموکووڕی، یان لایەنە خراپەکانی بابەتێك بە زمانێکی تەنزاوی دەسنیشان دەکا و وا دەنوێنێ کە ئەو کەموکووڕی و گەندەڵیانەی بە چاك زانیوە. بۆ وێنە:

*« عەزیز بە پێکەنینەوە قسەی کاك رەحیمی بڕی و گوتی: تەڕی لێ حاڵی بووە! بابە، خودا بیانپارێزێ ئەو لاوانە، هێند باسەوادن، خۆ کەسیان لێ حاڵی نابێ! ئەوە هەمووی مایەی سەوادی زۆرە.*

(باقەبێن، ئەحمەدی قازی)

### ٦ـ بەراوەرد:

لەو شێوەدا تەنزنووس، بابەتێك یان دوو بابەتی وەکوو یەك، لە دوو شوێن یا کاتی جیادا، بێهیچ لێکدانەوەیەك بەراوەرد دەکا و جیاوازیی نێوانیان بە شێوەیەکی تەنزاوی بۆ خوێنەر دەردەکەوێ. بۆ وێنە:

*هەواڵ(١) : مانگرتووانی بەردەم تەلاری پارلەمانی فەڕانسە، بۆ وتو وێژ و چارەسەری گرفتەکەیان بانگ کران.*

*هەواڵ(٢): پۆلیسی تاتارستان، مانگرتووانی بەردەم تەلاری پارلەمانی وەبەر شەق و باتووم دا.*

### ٧ـ درکاندنی مەبەست لە پەراوێزدا:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس باسێك دێنێتەگۆڕێ و لە باسە سەرەکیەکەدا نا، بەڵام لە پەڕاوێزی ئەودا جاروبار مەبەستی دەدرکێنێ. ئەو شێوەیە زیاتر لەگەڵ درێژدادڕی لەکار دەکرێ. بۆ وێنە:

*«ساڵێکیان کوڕی کەریمی دەستەبرام هاتە دووکانێ، کوڕە فیلێ بوو، بلە بۆریان پێدەگوت. بە رەحمەت بێ زۆریش قۆشمە و قسەخۆش بوو. (ها؟ کێ؟ ئیدی تۆ کارت بەوەی نەبێ چۆن مرد) هەر وە دەزانم ئەلحانە، لەسەر کورسیە مەخمەرەکە دانیشت. (کورسیەکان هەموو چەرم بوون. هەر تاقە ئەو یەکەی مەخمەر بوو، ئەویش دوای ئەوەی برایم ئاوای لێبەسەرهات، لام برد. چونکێ چاوم بەرایی نەدەدا لەوێی ببینم)».*
(عەینەك و سەمعەك، مزگێنی، محەمەدی رەمەزانی)

### ٨ـ بە هەڵە بردنی خوێنەر:

بە هەڵە بردنی خوێنەر کەرەسەیەکیتری تەنزە، بەم شێوەیە کە نووسەر بابەتێك باس دەکا و زەینی خوێنەر بۆ لایەك دەبا. بەڵام لە بەردەوامیی باسەکەدا بۆ خوێنەر دەردەکەوێ کە بە هەڵە چووە و ئەوەی چاوەڕوانیی دەکرد، تووش نەبووە. بۆ وێنە:

*میرزا حەسەن، لەو رۆژەوە کە بە چەپڵە رێزان لە سەر کورسیی شارەداریان دانا، هەتا ئەو رۆژەی بە فیکەفیك هێنایانە خوارێ، ماڵم هەقە شەو و رۆژ خەریکی خزمەت بوو ـ هەڵبەت بە خزم و کەس و گیرفانی.*

### ٩ـ کەڵك وەرگرتن لە نەزیلە:

گێڕانەوەی نەزیلە لە جێی خۆیدا، شێوەیەکیترە کە تەنزنووس دەتوانێ بۆ دەربڕینی رەخنە و مەبەست بێهیچ لێکدانەوە و دەسکاریەك کەڵکی لێوەرگرێ. بۆ وێنە:

*«کەریان بانگ دەکرد بێتە سەرشایی*
*کەر هاواری کرد ماڵی وێرانم*
*وا هەڵناپەڕم سەرچۆپیم دەنێ*
*گۆرانیی خۆشیش کەمتر دەزانم*

*بە خوا ئەترسم بمکەن بە ئـاوکێـش*

*یان باراشی باش بێتە سەرشانم»*

(بۆ کوردستان، ماموستا هەژار)

### ١٠ـ کەڵك وەرگرتن لە باسە ئاساییەکان:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس باسێکی ئاسایی دەگێڕێتەوە و پێوەنـدیی دەداتـەوە بـەو مەبەستەی دەیهەوێ دەریبڕێ و بەو جۆرە ئامانجی خۆی دەپێکێ. بۆ وێنە:

*«مام عـەزیز: ... قسـەکانی ئـەو چـەتیوە کـاکمی کوشـت. هـەر بـە زار خۆشـە بیستنی ئەوەی پێت بڵێین «کالیارە کۆن، تۆ لەجێی بابمی!»*

*جا بۆیە من ناوێرم سەمعەك لێبدەم. با ئەوەی گوێیم بـە جـارێ پـەکی کـەوتووە. دەترسم منیش شتێکی وا ببیستم ببێتە مایەی مەرگم.»*

(عەینەك و سەمعەك، مزگێنی، محەمەدی رەمەزانی)

### ١١- دانانی نێوی نائاسایی و تەنزاوی:

لەکار کردنی نێوی نائاسایی، ئامرازێکیترە کە ئەگەر تانەیەکی رەخنەگرانەی لە پشتەوە بێ، باری تەنز دەدا بە نووسراوەکە. بۆ وێنە:

*«عـەزیز: ئـەتۆ بـێبـەڵابی زوو رۆیشـتی، دوای هـەڤاڵ (ئاسـنوپـۆڵا)، هـەڤاڵ (گووراسن) و بە دووی ئەویشدا هەڤاڵ (بزمار) قسەیان کرد.»*

(باقەبێن، ئەحمەدی قازی)

### ١٢ـ لە کارکردنی قەید و ئاوەڵناوی نەگونجاو (رستەی نائاسایی):

ئامرازێکیتری تەنز، لەکار کردنی قەید و ئاوەڵناوی نـەگونجاو و دروسـت کردنـی رستەی نامۆیە. بە جۆرێك کە وشەکان بە ئاشکرا لە چاو دەدەن کە نالێکن و لـەجێی خۆیاندا نین و دەردەکەوێ کە تانەیەکیان لە پشتەوەیە. بۆ وێنە:

*کاك رەحمـەت، بـە رەحمـەت بـێ، هـەتا مـرد، بـە شـوغڵی شـەریفی شـەیتانی و شۆفاری، ماندوونەناسانە خەریکی خزمەت بوو.*

### ١٣ـ تانەی شاراوە:

لەو شـێوەیەدا تـەنزنووس راسـتەوخۆ رەخنـە لـە لایـەنی بـەرباس نـاگرێ، بـەڵام ناوەرۆکی بابەتەکە تانەیەکی لە خۆیدا حەشار داوە کە لایەنی بەر رەخنە دەگرێتەوە. بۆ وێنە:

*«ئەم: بە رەئی تۆ تەلەفزیۆن خەڵك فێری سەقافەت دەکا؟*

*ئەو: تەبعەن.*

*ئەم: چۆن چۆنی؟*

*ئەو: من خۆم تەجرەبەم هەیە... هەرسەعاتێ تەلەفزیۆنەکە داگیرسێنن، مـن لـە داخا ئەچمە ژوورەکەی ئەودیو دەست دەکەم بە کتێب خوێندنەوە.»*

(سیخورمە ژ. ٥٨)

*یان" کورە خۆ گەلانی دراوسـێ، مێـژووی ئێمـەیان چەواشـە کـردووە. سـەد بریـا فلانەکەسی مێژوونووسیش بە تۆڵەی خۆمان مێژوویەکی بۆ گەلانی دراوسێ نووسیبا.*

### ١٤ـ ویردی زمان:

زۆرکەس عـادەتیانە لە قسە کردندا، وشە یان زاراوەیەکی وەك (مەسەلا، عەرزت دەکەم، بەڕاستی و...) پەیتاپەیتا،بـەجێ و نابـەجێ، دووپـات دەکەنـەوە. تـەنزنووس دەتوانێ بۆ شـیرن کردنـی چیرۆك و دەمەتەقـە، لـەو کەرەسـەیە کـەڵك وەرگـرێ. بـە تایبـەت کاتێـك لـە زمـان توێـژە ناسـراوەکانی وەکـوو: (ئـاینی، بـازاڕی، لەشـکری و...)ەوە دەدوێ.

### ١٥ـ خوازەی شاراوە:

هـەر وەکـوو دەزانـین، لـە خـوازەی شـاراوە (اسـتعارەی مکنیـە)دا یـەکێك لـە تایبەتمەندیـەکانی پـێشـوبهێندراو لەگـەڵ شـوبهێندراو دەکـەوێ و ئـەو شـوبهاندنە نائاشکرایەش دەتوانێ وەك کەرەسەیەکی تەنز بەکار بێ. بۆ وێنە:

*«مام وەسمان لە کاتی نانکردندا بەسـەر ژنەکانـەوە رادەوەسـتێ. گونتکـەکان بـە دەست هەڵدەسەنگێنێ، بێتوو هەست بکا یەکیان تۆزێك گەورەیە، هەڵیـدەگرێ و بـە*

*دەنگێکی تووڕەی گۆڵانەوە بە ئامینی بووکی دەڵێ: ((تەماشای ئەو ئەنگوتکەی! وەڵڵاهی بەقەرا گوانی زارا سووری دایکت دەبێ!))*

(کابرایەکی ئاوا، مزگێنی، محەمەدی رەمەزانی)

## ١٦ـ تەشبی و خوازەی بەرچاو:

تەشبی و خوازەی بەرچاویش لەو کەرەسانەن کە لە تەنزدا بەکار دێن و ئەگەر هونەرمەندانە هەڵبژێردرێن و بەجێ لەکار کرێن، بابەتەکە شیرن و تەنزاوی دەکەن. بۆ وێنە:

ئەلف) تەشبی: *((کۆشکی ئاغایی وەکوو کوندەبووی گەرۆڵ بە بەربەرۆچکی دێی (سەرکەل)ەوە هەڵنیشتبوو لە هێندێ جێ پاسارەی بانەکان کەوتبوونە خوارەوە، لە هێندێ جێش داچۆڕابوون، دەتگوت دەمی گزیری پیرە لەبەر کرووساندنەوەی ئێسقانی پاشخوان و چەقەی زۆری چەند ساڵە لەگەڵ بێگارچیەکان ددانی تاق و واز کەوتووە و ئەوی ماویشەتەوە خوار و خێچ بووە)).*

(بیهێنە ئەما ناوی مەبە، پێکەنینی گەدا، حەسەنی قزڵجی)

ب) خوازەی بەرچاو: *((بەغدا وەکوو پیوازی توێتوێ وایە، ئەوەی بە بەرچاوەوەیە توێی سەرەوەیە و شارەزابوونی ئاسانە، جادەیە و ئەمبەر و ئەوبەری مەغازەیە، ﴿...﴾ ناوەرۆکی ئەو پیوازەش رواڵەتێکی هەیە کە ناوی بازاڕە...))*

(عادەتی بازاڕ، پێکەنینی گەدا، حەسەنی قزڵجی)

## ١٧- لاساکردنەوەی تەوساوی:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس دەچێ لە قالبی لایەنی بەر رەخنەوە و بە شێوازی ئەو دەدوێ و بە زمانێکی شیرن و تەنزاوی، کردەوە چەوتەکانی زەق دەکاتەوە و لێی لە هەڵلا دەدا. بۆ وێنە:

*((ئەمجارەیان لە نامەیەکا هەڵوێستی منت ویستبوو بەرامبەر بە رەخنەگران و شیکارانی شیعری ئەم سەردەمە. زارخۆش برا! بە راستی ئەمە سووژەیەکی نایابە.*

*من وەك هەر شاعیرێکی‌تر! بە رادەیەك لەم بەرێزانە دڵپڕم، هەر مەپرسە! جا تۆ خوا رێگام بدە لەپێش‌دا کوڵکەی رەخنە و رەخنەگر دەرێنم، ئەنجا لە نامەیەکی‌ترا شی‌کارانت بۆ شی دەکەمەوە!»*

(سروە ژ ١٤١ ، نامەکانی شەندە بۆ شاعیرێکی لاو، عەلی ئیسماعیل‌زادە)

### ١٨ـ نێو دێر کردن بە دژ:

هەروەکوو دەزانین تەنزنووس زۆرجار بە پێچەوانەوە دەدوێ و مەبەستی خۆی بەراوەژوو دەدرکێنێ. هەر بۆیە نێو دێر کردن بە دژ، وەك ئامرازێکی سەرەکیی تەنز دێتە ئەژمار. بۆ وێنە:

*ئەو پاڵەوانە بێ‌وێنەیە هەر تەقەی تفەنگی بیست، کونەمشکی لێبوو بە قەیسەری.*

کە دیارە مەبەست لە «پاڵەوان»، «ترسەنۆك»ە.

### ١٩ـ هەڵەی سەرزارەکی:

هەڵەی سەرزارەکی یەکێکی‌تر لە ئامرازەکانی تەنزە، بەوجۆرەی کە تەنزنووس، وەك ئەوەی هەڵەیەك بکا و خێرا راستی کاتەوە، لەپێش‌دا مەبەستی سەرەکیی دەدرکێنێ و بێ نێوبڕ داوای لێبوردن دەکا و هەڵە ئانقەستەکە راست دەکاتەوە (هەڵبەت هەڵەی سەرزارەکی زیاتر لەگەڵ کایە بە وشەکان لەکار دەکرێ و زۆر بەکارهێنانی تەنز ناشیرن دەکا).

بۆ وێنە: *جەردەکان! (ببوورن جەردەوانەکان) هێرشیان بردەسەر خەڵکی گوندەکە و تاڵانیان کردن.*

### ٢٠ـ وەرچەرخان لە تەنگەژەدا:

یەکێکی‌تر لە ئامرازەکانی تەنز، وەرچەرخان لە قۆناغی‌ناسك دایە. بەو مانایە کە تەنزنووس لە زمان کەسایەتێکانەوە لە جێگایەکی ئەستەم‌دا، بە لێزانی و بە پەلە باسەکە دەگۆڕێ و زیرەکانە خۆی لە کێشەکە دەربازدەکا. کە ئەو وەرچەرخانە، بۆ خوێنەر شیرن و چاوەڕواننەکراوە.

بۆ وێنە:

*«میرزا (کەداخی عەوڵای لە دڵدا بوو): شوکور باوکی نەماوە، ئەگینا بێگەنمیش دەیهێنایە سەما.*

*کوێخا عەوڵا تێگەیشت مەبەستی میرزا ئەوەیە باوکی عەوڵا رەعیەت بوو. ئەگەر بمایە ئەویشی بە دەردی رەعیەتەکانی دیکە دەبرد. گوتی: من نمەك بەحەرام نیم. ئاغام چۆنی پێ خۆش بێ وادەکەم.*

*میرزا کە زانیی قسە دەگاتە ناسکی، گوتی: ئاغا حەز دەکا تەماڵی بۆ بدۆزیتەوە».*

(ئاغا وەجاخی رۆشنە، پێکەنینیگەدا، حەسەنی قزڵجی)

۲۱ـ وەسەر تەڵە پەڕاندن:

وەسەر تەڵە پەڕاندنی خۆهەڵکێش و فیشاڵباز (لە چیرۆك و بەسەرهاتدا) یەکێکیتر لەو کەرەسانەیە کە بۆ تەنز لەکار دەکرێ. بەو جۆرەی کە، بە پێچەوانەی وەرچەرخان لە تەنگەژەدا، بە ئانقەست بارودۆخێکی وا دەرەخسێنرێ کە کەسایەتیی فیشاڵباز بە تەڵەوە بێ و بە درۆی زەق و ئاشکرا، بە زمانی خۆی لەخۆی لەقاو دا و دەروونی وەدەرخا. بۆ وێنە:

*«میرزا رەحمانی بانەیی لەناو قساندا لە شێخ نەجمەدینی پرسی: هەژاری ئاواڵت لە کوێیە؟*

*گوتی: دەڵێن لە بیارەیە. بریا بهاتبایەتە ئێرە، ئای چەند بۆی بە تاسەوەم! دەستی کرد بە حیکایەت گێڕانەوەی هەواڵەتیی گەرمی خۆی و من (هەژار) کە چەند ساڵ پێکەوەمان خوێندووە.*

*میرزا گوتی: سوێند بخۆ کە درۆ ناکەی! شێخ نەجمەدین قوت بوو، تەماشایەکی منی کرد و گوتی، ناکا ئەوە هەو بێ، بە خوا نەمدیوە، بەڵام خۆشم دەوێ!»*

(چێشتی مجێور، مامۆستا هەژار)

### ٢٢ـ لێکدانەوەی دڵخواز:

لەو شێوەیەدا تەنزنووس مانای بەیتێك شیعر یان پەند و مەسەلێك، بەکەیفی خۆی لێكدەداتەوە و ئەو مەبەستەی دەیهەوێ دەریبڕێ، لە مل شیعر و مەسەلەکەی دەپەستێوێ. بۆ وێنە:

*«لەو رۆژە کە دوور بۆتەوە سایەت لەسەری من*

*سووتاوە لە تاوت هەموو جان و جگەری من»*

(وەفایی)

مانا و لێکدانەوە: *ئەو بەیتە شیعرە کە پەڕیوەی دیوانی وەفایی بووە، لەڕاستیدا فڕی بەسەر وەفاییەوە نیە و هی شاعیرێکی هاوچەرخێتی کە دوای چەند ساڵ خزمەت بە دەوڵەتی قەجەرێکان و دڵی خەڵك و خوا لە خۆ کردن، وەك مشکی نێو خیگە، بە پەڕۆیەکی تەڕ کلکیان گرتووە و فڕێیان داوە. جا کابرای گۆرین بەو شیعرە سکاڵای ناردووە بۆ ئاغای پێشووی تا بەشکم ئەوە خوایە، دووبارە رایگرنەوە و بە نانی پێشخانە چاوی روون بێتەوە.*

### ٢٣ـ رەمز:

لەو شێوەیەدا کە زیاتر بۆ تەنزی سیاسی لەکار دەکری، تەنزنووس راستەوخۆ لایەنی بەر رەخنە نێودێر ناکا و بە ڕواڵەت رووداوێك بە زەمان یان شوێنێکی دوورەوە دەلکێنێ“ یاخود باس و لایەنەکان، بە جۆرێك دەگۆڕێ کە بە ئاشکرا نەناسرێنەوە. بەڵام نیشانەگەلێك بەدەستەوە دەدا کە بزانین مەبەستی چیە و دەڵێ چی. بۆ وێنە:

*دەگێڕنەوە لە زەمانی نادرشای هەوشاردا، کاتێك ئەمر کرا خەڵك نوێنەر هەڵبژێرن، لەو زابولە کابرایەك دەمی هێناپێش کە: خەڵکینە! ئەمن نەوەی رۆستەمی دەستانم و چیها هەژدیها و دێوم کوشتوون و حەوخانم بڕیوە و... ئەوەندەی بەخۆ هەڵکوت تا خەڵکی خۆشە کرد و کەوتە سەر خوانی هەشتەم.*

## ٢٤ـ عوزر لە قەباعەت خراپتر:

جاری وایە تەنزنووس لە زمان کەسایەتیەکەوە پاساو بۆ خەتایەك دێنێتەوە، بەلاّم هەروەك لەنێوەکەیڕا دەردەکەوێ، بەجێی ئەوەی کارەکە چاك بکا، خراپتری دەکا" کە بیستنی وەلاّمی لەو جۆرە بۆ خوێنەر شیرن و پێکەنینیە و وەك کەرەسەیەکی تەنز دەژمێردرێ. هەروەها جاری واشە لە زمان تاکێك یا چەند کەس، زنجیرلەمە پاساو دێنێتەوە و جار لەگەلّ جار کارەکە خراپتر دەکا، کە شێوە تەنزێکی شیرین و هونەرمەندانەی لێساز دەبێ ئەگەر رەخنەگرانە بێ. بۆ وێنە:

*«باوك: کوڕی باوکم واشوکور بووی بە شازدە سالّ، یەعنی ئیتر منالّ نی. بە قوربانت بم ئاگات لە رەفیقی خراپ بێ" فێری جگەرە کێشانت نەکەن.*

*کوڕ: نا بابە گیان مەترسە. دوو سالّە تەرکم کردووە.»*

(سیخورمە ژ. ٥٨ )

یان:(بڕوانە چیرۆکی کوڕەی خۆشناوەتی و دەزگیرانەکەی لە بەری کۆیە ل ٥٩ــ٥٧، بەرگی سێهەم، رشتەی مرواری، عەلائەددینی سەججادی).

## ٢٥ـ کۆی نالێك:

کۆکردنەوەی چەند دیاردەی نالێك کە پێوەندیان پێکەوە نیە، یان دانانی نابەجێی شتێك، کەرەسەیەکیترە کە بۆ تەنزاوی کردنی بابەت کەلّکی لێوەردەگیرێ. بۆ وێنە:

*«مام وەسمان کە نانی، نان هاسایی لە عەولادەکانی بەچاوە، هەر کە چاوەش دێنە ئاوایی و مۆسیقا دەژەنن، ئەوەی پوولّی لە گیرفانی دایە لە نێویاندا بەشی دەکا و زۆرجار بەوەش سوکنایی نایە چاوەشەکان بانگێشتن دەکا».*

(کابرایەکی ئاوا، مزگێنی، محەمەدی رەمەزانی)

یان: *دەلّێن کابرایەکی پیوازفرۆش لە خالّێکی پشکنین گیرابوو" دوای پاڕانەوەیەکی زۆر کە ئیزنیان دا بڕوا، کابرای خەجلاّو لە خۆشیان تای تەرازۆکەی پڕکردبوو لە پیواز و فەرمووی چەکدارەکانی دەکرد.*

### ٢٦ـ بەراوەردی نابەجێ.

گـەلێ جـار بـەراوەردی نابـەجێ وەك هەڵەیـەکی زەق دەبێتـە هـەوێنی تـەنز و پێکەنین. بەو شەرتەی ئەو بابەتانەی بەراوەرد دەکرێن بـە رواڵـەت لێـك نزیـك و لـە راستیدا جیاوازیی بنەڕەتیان هەبێ. بۆ وێنە:

*دەگێڕنەوە دەڵـێن کابرایـەك چـووە لای سـوڵتان مـەحموود. سـوڵتان لێـی پرسـی مریشك کوێی خۆشە؟ گوتی: پێستەکەی. سوڵتان فـەرمانی دا سـەد دیناریـان دایـە. کابرا دۆستێکی بـوو تـەماح گرتـی و بـەو پێودانـە رووی لـە بارەگـای پادشـا کـرد و سوڵتانی تێگەیاند بۆچی هاتووە. ئینجا سوڵتان مـەحموود لـەوی پرسـی کـەڵ کـوێی خۆشە؟ کابرا بە قیاسی وەڵامی دۆستەکەی، گوتی: پێستەکەی و بـەجێی خـەڵات بـە شەق وەدەریان نا.*

### ٢٧ـ وەڵامی بێوەڵام:

وەڵامی بێوەڵام، شێوەیەك جواب دانەوەیە کە لایەنی بەرپرسیار هەر لە پرسیاری کابرا بۆ بەڵگەی وەڵامەکەی کەڵك وەردەگرێ و وەڵامێکـی ئەوەنـدە قـورس و قـایمی پرسیارە تەوساویەکە دەداتەوە کە رەتبوونەوەی بـۆ نیـە. ئـەو شـێوە وەڵامـە ئەگـەر تانەیەکی رەخنەگرانەی لە پشتەوە بێ. تەنزی لێساز دەبێ. بۆ وێنە:

*((کابرایەکی دەوڵەمەندی ترزلی بێچـاو و روو تووشـی مەلایـەکی خێـل دەبـێ و دەڵێ: مامۆستا! راستە دەڵێن پیاوی خێل یەك بـە دوو دەبـینێ؟ مـەلا دەڵـێ: بـەڵێ وایە، کابرا دەپرسێ چۆن؟ دەڵێ: ئەوەتا تۆ دوو پێـت هەیـە" کەچـی مـن بـە چـواری دەبینم)).*

(رشتەی مرواری، بەرگی یەکەم، عەلائەددین سەججادی)

### ٢٨- هۆکاری نابەجێ:

هۆکاری نابەجێ ئامرازێکیتری تەنزە، بەو شێوەیە کە لە بارتەقای پرسـیارێکدا، وەڵامێك دەدرێتەوە کە هـیچ پەیوەنـدیی بـە پرسـیارەکەوە نیـە و بـەو جـۆرە کـابرای

بەرپرسیار بە ئاماژەیەکی تەوساوی پرسیارکەر تێدەگەیەنێ کە وەڵامەکەی روون و ئاشکرایە. بۆ وێنە:

*مەشهوورە دەڵێن: ئەرێ فڵانە کەس لە سەر چی گیراوە؟*

*لایەنی بەرامبەری: لە سەر نوێژی بەیانی! لە قسان بەیانیان زوو هەڵدەستا بۆ نوێژ!*

## ٢٩ـ تیز تێگرتن:

تیز تێگرتن شێوەیەکی تەنزە کە تەنزنووس بەشێك لە قسە، یان نووسراوەی لایەنی بەرامبەری دەسنیشان دەکا و بە زمانێکی شیرن تانووتی لێدەدا. شەرتیش نیە ئەو تانەیە هەر نووسەری وتەکە بگرێتەوە و دەکرێ ئەو قسەیە بکرێتە بەهانەیەك بۆ رەخنە لە لایەنێکیتر. بۆ وێنە:

*لە وتووێژێك لە سیرواندا: «سەبارەت بە شیعری ئەودیویش دەتوانم بڵێم کاتێك بەختیار عەلی و کەسانیتر فەلسەفە بفیچقێننە شیعرەوە.*

*ـ عەلی ئیسماعیلزادە: فیچقاندن! ئەمەیە پەتای ئەدەبی کوردی.»*

(مەهاباد، ژ ٢٩)

*«پشووی کوردستانی نوێ: ئەو کوڕەی حەز بە سووراو و سپیاو دەکا.*

*سیخورمە: کە سوێند ئەخوا ئەڵێ بەسەری زاواکەمان»* (سیخورمە، ژ ٦٥).

*هەواڵ: بەرهەمی سپیایی کوردستان، لە وڵاتانی دەر و جیرانی زیاترە.*

*ـ وەڵڵا ئەوە بۆیە ماستاوکەری وا چاکمان لێهەڵدەکەوێ.*

یان، *دەڵێن: کابرایەك کوڕێکی دوازدە ساڵانی لەگەڵ خۆپیشاندەران راپێچەکی زیندان درابوو و خەبەریان دایە کە: کوڕەکەت گیراوە.*

*گوتی: ئای دنیا! ئەوە نەمردم و دیم ئێمەش تێماندا هەڵکەوێ. ئەوە حەسەنی کوڕم لەسەر سیاسەت گیراوە.*

**٣٠ـ ئاكامی بەراوەژوو:**

ئاكامی بەراوەژوو كەرەسەیەكی تری تەنزە بەو جۆرەی كە لـە كۆتـایی باسـەكەدا نە تەنیا كەسایەتیی بەرباس بە ئاكام ناگا، بەڵكوو لـەوەی هەشـە دەبـێ. تـەنزنووس زۆر جار ئەو ئامرازە وەك تاكە كەرەسەیەك لە كۆتایی چیرۆكدا بەكار دەبا. بۆ وێنە:

*«كۆسە چوو بۆ ریش، سمێڵی دانا».*

بێگومان ئەو شێوە و ئامرازانەی باس كران، سەرجەم شێوە و كەرەسەكانی تـەنز نین و زۆری تر هەن كە وەبەر زەین نەهاتوون و لە قەڵەم كەوتوون. هـەروەها تـەنزیش وەك هەموو هونـەرێكیتـر بـەردەوام لـە گەشـە و پێشـكەوتن دایـە و لـەوە بـەدواش تەنزنووسان نوێكاریی تێدا دەكەن و بێشك شێوە و كەرەسەیتر دادێنن.

## سەرچاوەی نموونەکان:


١. زاکانی، عبید" کلیات عبید زاکانی، تهران، انتشارات زوار، چاپ دوم، ١٣٤٣.

٢. نالی" دیوانی نالی، بەغدا، کۆڕی زانیاری، ١٩٧٦.

٣. وەفایی" دیوانی وەفایی،ئینتشاڕاتی سەلاحەددینی ئەییووبی .

٤. سەججادی، عەلائەددین" رشتەی مرواری، ؟ ، بەرگی یەکەم ،١٩٥٧.

٥. سەججادی، عەلائەددین" رشتەی مرواری، سەقز، محەممەدی، بەرگی سێهەم، ١٩٥٨.

٦. قزلجی، حەسەن" پێکەنینی گەدا، بەغدا، چاپخانەی علاو، چاپی دووهەم، ١٩٨٥ز.

٧. هەژار" بۆ کوردستان، تاران، جەواهێری، چاپی سێهەم، ١٣٥٨.

٨. هەژار" چێشتی مجێور، پاریس، چاپی یەکەم، ١٩٧٧.

٩. هێمن" نالەی جودایی، مەهاباد، چاپەمەنی سەیدیان، چاپی پێنجەم.

١٠. حیسامی، خالید (هێدی)" کاروانی خەیاڵ، سەلاحەددینی ئەییووبی. چاپی یەکەم، ١٣٦٤.

١١. قازی، ئەحمەد، باقەبێن، چاپی یەکەم، ١٣٦٠

١٢. رەمەزانی، محەمەد" مزگێنی، سەقز، ئینتشاڕاتی محەمەدی، چاپی یەکەم، ١٣٧٧.

١٣. دەورەی گۆڤاری سروە.

١٤. دەورەی گۆڤاری سیخورمە.

١٥. دەورەی گۆڤاری مەهاباد.

١٦. کاریکاتۆڕەکانی برایانی قورەیشی.

# قەیرانی ئەدەبی

ئەو رۆژانە، بە داخەوە کۆڕی شاعیرانی لاوی کوردستان، بۆ هەڵبژاردنی نێوی کلك پەڕیو* (نازناوی پێشوو و تەخەللوسی هەرە پێشوو) تووشی تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفتێکی لە دوو نەهاتوو بوون و نێوی کلك پەڕیو، بە تەسەلی بە هەمووی ئەو خۆشەویستانە راناگا و زۆرجار چەند شاعیری بەستەزمان مەجبوور دەبن، بە شەریکی لە نێوێکی کلك پەڕیو کەڵك وەرگرن، کە ئەوەش دەبێتە هۆی تێکەڵ بوونی شاکارە ئەدەبیەکان و بۆی هەیە بەعزە شاعیرێك لەبەر ئەو هۆیە، شیعریان کوڕڕە گوێ بێ و ئاوەکیی دیوانی قەت چاپ نەبینی شاعیرێکیتر بێ و بەو جۆرە زەرەر و زیانی قورسی مەعنەویان لێ بکەوێ، کە زەرەدی مالی لە حاندی پووشێکە و هەرگیز قەرەبوو نابێتەوە.

رەنگە هێندێك ئینسانی بەدبینی بەرچاو تەنگ، بڵێن: جا خۆ زۆربەی ئەو کەسانەی لە حەول و دەولی هەڵبژاردنی نێوی کلك پەڕیودان، هێشتا شیعرێکیان دانەناوە" فارس کوتەنی: با لە پێشدا برایەتیان بسەلمێنن، جا دوایە داوای میرات بکەن.

ئەو برادەرانەی کە ئەو قسەیە دەوشن، زۆر لان. چون" ئایا بەننا بێ کەمچە و ماڵە مالی بۆ ساز دەبێ؟! پالە بێ داس و مەڵەغان دروێنەی پێدەکرێ؟! راوچی بێ تاجی و تولە نێچیری پێدەگیرێ؟ بێشك نا" دەی شاعیری بەستە زمان بێ نێوی کلكپەڕیو چۆن شیعر بهۆنێتەوە؟! دیارە شتی وا قەت ناگونجێ" چون بە بڕوای من نێوی کلك پەڕیو (کە هێندێك بە رواڵەت وێژەوان رخنەی لێ دەگرن و دەڵێن «ناوی

کلك‌بڕاو» دروسته چون مەوزونتره و من له جێی خۆیدا وەڵامیان دەدەمەوە) سەرەکی‌ترین کەرەسەی شاعیریه و بۆ شیعردانان له تەبع و زەوق و ئیستیعداد و بەهرە و مەعلوومات و تەنانەت له نانی شەو و پێڵاوی رۆژیش واجبتره.

جا ئێستا که گرینگیی ئەو مەبەستەمان بۆ روون بۆوه، من به ئەرکی سەر شانی خۆم زانیوه، بۆ رزگار کردنی ئەو شاعیره زەحمەتکێشانه لەو تەنگ و چەڵەمەیه و کۆتایی هێنان بەو قەیرانە ئەدەبیه، ئەوەندەی له توانام دایه هەوڵ بدەم“ که بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانم چەند پێشنیارێکه ئاراستەی! ئەو خۆشەویستانەی دەکەم و هیوادارم رەچاوکردنیان، دەرمانی ئەو دەردە کوژەندەیه بێ و چارەسەری ئەو گرفته گەورەیه بکا و گرێپووچکەی ئەو ماشەره ئاڵۆزاوه بکاتەوه و، ئەو بەستەزمانانه چیدی دەردی بێ نێوی نەکێشن.

پێشنیارەکان:

١ـ شاعیره خۆشەویستەکان بۆ هەڵبژاردنی نێوی کلك پەڕیو، خۆیان له پاوانی هیچ جەغزێکدا نەبەستنەوه و له هەر وشەیەکی قامووس گرتبێی، بریتی له: زیندوو و مردوو، دار و دەوەن، گوڵ و گیا، کۆن و نوێ و ... بێ دڵەڕاوکێ کەڵك وەرگرن. به قەولی زۆرابی سپێری قەلەبەڵەکه چی له کۆتر کەمتره؟ چ عەیبێکی هەیه بۆ وێنه ئەو وشەیه، که ئەزقەزا زۆریش رەسەن و له زاران خۆشه، نێوی کلك پەڕیوی چەند شاعیری ناسك خەیاڵ بێ: (مامۆستا قەلەبەڵەکه).

٢ـ ئەگەر چەند شاعیر پێکەوه حەزیان له نێوێکی کلك پەڕیو بوو، هیچ ئیرادی نیه، دەکرێ به هاوبەشی کەڵکی لێ وەرگرن بەڵام به ریز نیشانه حیسابیەکانی پریم و زیگۆنت و تییەرزیان لەسەر دانێن. بۆ وێنه: مامۆستا خۆڵەمێش پریم، مامۆستا

بڕبەند زیگۆنت، مامۆستا داپلۆخاو تییەرز. (قسەی خۆمان بێ بڕێکیان لە خاریجی دەچن و دەکرێ بەو جۆرە لافی جیهانی بوونیشیان پێوە لێدەی).

٣ـ پاشگری شاری شاعیرەکە وەك ژمارە لیزگەی ئوتومبیل، بە دووی نێوە کلك پەڕیوەکاندا بنووسن. بەو جۆرە ئەگەر نێو و نیشانەی شاعیری دوو شاریش یەك بن، بە نێوی شارەکاندا لێك هەڵداوێژرێن. بۆ نموونە: مامۆستا تۆز و خۆڵ پریمی بانە، مامۆستا تۆز و خۆڵ پریمی بۆکان، مامۆستا کەرتەشی زیگۆنتی مەهاباد، مامۆستا کەرتەشی زیگۆنتی مەریوان و ...

وێدەچێ بە ڕەچاوکردنی ئەو پێشنیارانەش، دیسان کەمایەسیی نێوی کلك پەڕیو، بۆ شاعیرە لاوە خۆشەویستەکان بە تەواوی چارەسەر نەکرێ و ئەو بەستەزمانانە هەروا هەڵوەدا و بێ دەرەتان بمێننەوە. جا لێرەدا بە دەرفەتی دەزانم لە تەواوی بنکە و ڕێکخراوە فەرهەنگی ـ ئەدەبییەکانی دنیا، بە تایبەت بنکە نێونەتەوەییەکان، لە هەموان زیاتر ریکخراوی بەڕێزی یۆنسکۆ، داوا بکەم کە بە ناردنی نێوی کلك پەڕیو بە رادەی پێویست، شاعیرانی لاوی وڵاتەکەمان یارمەتی بدەن و نەهێڵن ئەدەب و وێژەی نەتەوەیەکی ڕەسەنی مێژوویی قسر بمێنێتەوە و هەروا بە فیڕۆ لە ناو بچێ.

١٣٧٦

---

* نێوی کلك پەڕیو، بە بەراوەردی «ئەستێرەی کلك دار» داندراوە و ئاماژەیەکە بۆ خزمەتی بەرچاوی ئەو ئازیزانە، کە ئەوانیش، خودا تۆفیقیان بدا، بۆ خۆیان لە ئاسمانی وێژە و ئەدەبی نەتەوەکەیاندا، ئەستێرەیەکی پڕشنگدارن.

# زانایانی ئەو سەردەمە

ئێمەی کورد هەرچەند لەبەر سیاسەتی شوومی پاشایەتی، لە رابردوودا دەرەتانی ئەوەمان نەبووە ئەو جۆرەی پێویستە خزمەتی زمانەکەمان بکەین، بەختەوەرانە بە هەوڵ و تێکۆشانی چەند زانا و کەڵە شاعیری بلیمەتی هەڵکەوتوو، لەو دواییەدا توانیومانە تا رادەیەکی زۆر ئەو دواکەوتنە قەرەبوو بکەینەوە و ئەدەبی خۆمان بگەیەنینە گەلانی پێشکەتوو و تەنانەت لە هێندێ بواردا، رچەشکێن بین و وەپێشیشیان بکەوین.

یەکێك لەو زانا و بلیمەتانەی ئەو ئەرکە قورسەیان لەسەر شان بووە و بەو چەند ساڵە کاری چەند سەدەیان کردووە و خەڵکی ئەمەگناس هەتا هەتایە لە بیریان ناکا و مێژووی وێژە بە شانازیەوە لاپەڕەکانی بە نێوی پیرۆزیان دەڕازێنێتەوە، کاك مستەفای ئێلخانیزادە، وەرگێڕی پاڵەوان فسفس و نووسەری ئاشەوانە.

من لێرەدا ناتوانم ئەو جۆرەی پێویستە خزمەتی ئەو بەرێزە بە دنیای ئەدەبیات باس بکەم. بۆیەش دەڵێم دنیای ئەدەبیات، چون هێندە تینووی خزمەتە، بە زمانی کوردی ئۆخژنی لە دڵ نەگەڕاوە و پەلاماری زمانی دراوسێکانیشی داوە و لەوانیشدا شوێنەواری بەجێ‌ماوە. هەروەها ئەو مامۆستایە خۆی بە تەنیا لقێکی ئەدەبەوە نەبەستۆتەوە و لەهەموو بەشێکدا دەسەڵاتی خۆی نواندووە.

جا هەرچەند بە هۆی بەربڵاویی خزمەتی ئەو بەرێزە بە دنیای ئەدەبیات، ناساندنی لە توانی منی بێ دەسەڵاتدا نیە و ئەگەر لە تواناشم دابا لەو وتارەدا جێی نەدەبۆوە و کۆڵێکی قاقەزی کیلۆی چوارسەت و پەنجا تمەنی دەویست، دیسان دەبێتە سپڵەیی خۆی لێ ببوێرم و باسی نەکەم. منیش لە بەر ئەوە بە پێی توانام بە قەولی

کوتەنی لە خانویٚ خشتێك و لە هەشتان مشتێکی لیٚ دەخەمە بەر چاو، کە هیوادارم ببێتە سەرەتایەك بۆ ناساندنی ئەو ئەدیبە بەڕێزە و قەڵەم بەدەستانی خۆشەویست بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە هەراوە لە ئەدەبی کوردیدا هەوڵ بدەن و پتری بناسێنن:

ژمارەی کتێبە چاپ کراوەکانی ئەو هێژایە، هەر چەند ناگاتە ژمارەی کتێبەکانی مامۆستا بورەکەیی، بەڵام لە شوێنەوارەکانی محەمەد زەکەریای رازی گەلیٚ زیاترە (کە مێژوو نووسانی بەڕێز، مامۆستایان تەوەککولی و فاڕووقی، لەبەر ئەوەی کوڕی زەکەریا یەك دوو جار بە کوردستاندا هامووشۆی بەغدای کردووە، بە سوێند وکەلامەڵڵاوە رەش دەبنەوە و سیٚ بە سیٚ تەلاق فڕیٚ دەدەن کە کوردە و و دەڵێن: شۆرەتی «رازی» بە مانای خەڵکی شاری «رەی» نییە. بەڵکوو چون کورد بوونی خۆی شاردۆتەوە و ئەو رازەی لای کەس نەدرکاندووە بەو نێوە نێوبانگی دەرکردووە).

هەروەها من هەرگیز ناتوانم بۆ کتێبە رەنگاورەنگە ئەدەبییەکانی مامۆستا ئێلخانیزادە نرخێك دیاری بکەم. چون رۆژ بە رۆژ پلەی تەوەڕڕوم دەشتە سەر و قاقەز گران دەبیٚ. جا لێرەدا زۆر بە کورتی و بە شێوەیەکی گشتی باسی ئەو بابەتە جۆراو جۆرە ئەدەبییانە دەکەم کە ئەو مامۆستایە هەوڵی بو داون و شوێنەواری لیٚ بەجیٚهێشتوون.

قەڵەمی رەنگینی ئەو هێژایە لە چیرۆك نووسیشدا هەر وەك وەرگێڕانی! کتێبەکان، گەلیٚ شاکاری بە نرخی خولقاندووە و بمانەویٚ و نەمانەویٚ خۆی بە سەر وێژە و ئەدبدا سەپاندووە و توانا و دەسەڵاتی خۆشی چەسپاندووە. بۆ وێنە قەڵەمی سێحراویی ئەو بەڕێزە لە ئاشەوان و پاڵەوان فسفسدا کارێکی کردووە کە زۆربەی خەڵك لەبەر نێوبانگی بەربلاویان، وەك «نەسیمی شومال» بەدووی نێوی نووسەردا دەیانلکێنن. ئەوەش دیارە ئەو پەڕی سەرکەوتوویی ئەو شاعیرە دەگەیەنیٚ لە چیرۆك و وەرگێڕاندا. هەروەها ئەو بەڕێزە لە وەرگێرانی بابەتە ئەدەبی و نائەدەبیەکاندا، لە باری بارستاوە دەستێکی باڵای هەیە و بە یەکێك لە وەرگێرە پڕکارەکانی سەدەی

بیستەم دێتە ئەژمار و کتێبخانەکانی بە وەرگێڕاوە فارسی بـە کـوردی و کـوردی بـە فارسیەکانی تەپ داوە و زۆر جار تەنانەت کتێبێکی لە فارسـیەوە کردۆتـە کـوردی و سەر لە نوێ کوردێکەی کردۆتەوە فارسی، کە ئەوەش داهێنـانێکی یـەگجار جوانـە و دیارە لە پێش وی دا کەس فکری بۆی نەچووە و هەر خۆی لـەو بـوارەدا رچەشـکێن و پێشەنگە. جا هیوادارام وەرگێڕانـی خۆشەویسـت لەمـەو دوا، نـەبوونی کتـێبی بـاش نەکەنە بیانوو و بـە شـێو و وەرد دانـەوەی کتێبـە وەرگێڕاوەکـان، تـا هـەر زەمانێـك پێویست بیٚ دەتوانن خۆیان خەریك کەن.

ئەو وەرگێڕە پڕکارە لە وەرگێڕاندا سەرەڕای باری ئەدەبی، لە باری ئینسانیشـەوە خزمەتێکی گەلیٚ بەرچاوی کردووە و بە تێکەڵاو کردنی ڕێزمـانی کـوردی و فارسـی، بۆتە هۆی لێك نزیك بوونەوەی پتری ئەو دوو زمانە رەسەنە مێژووییە کە جێـی خـۆی بوو لەبەر ئەو کـارەی، جـایزەی (ئاشـتیی ئـەدەب)ی نـۆبێلی بـدەنیٚ و ئەگـەر تـا ئێستاش نەیانداوەتیٚ، خۆ بە خۆیەتیان لیٚ کردووە و هەقیان خواردووە.

هەر وەها بۆ ناساندنی نرخی وەرگێڕاوەکانی ئەو بەرێزە، بە تایبەت چیرۆکەکانی «**عەزیزی نەسین**»، ئەوەندە بەسە کە دەنگۆیە دەڵێن: **عەزیزی نەسین لە داخـان دیقـی کرد**. چون چیرۆکەکانی ئەو بە زمانی تورکیی ئیستامبوولی، وەك وەرگێـڕاوە کـوردی و فارسیەکانی کاك مستەفا برەویـان نـەبوو. (شـایانی باسـە بەختەوەرانـە مامۆسـتا ئێلخانیزادە ئەو رۆژانە فەرهەنگی تورکیی ئیستامبوولی بە کـوردی دەنووسـیٚ ـ لـە رووی وەرگێڕانی تورکی بە فارسـی ـ و بـۆی هەیـە تـا ئـەو وتـارە چـاپ دەبـیٚ، ئـەو فەرهەنگەی وی بە چاپی سیٚ و چواریش بگا. ئیشەڵڵا).

ئەو بەڕێزە، خودا تۆفیقی بدا و بیٚ چاوێنی بیٚ، جگە لە چیرۆك و وەرگێـڕان، لـە بواری شیعر و شاعیریشدا کەڵە شاعیرێکی بەرچاوە و خزمەتی یـەگجار زۆرگـەورەی لیٚ رووداوە. ئەو شاعیرە دڵسۆزە، خزمەتێکی وای بە دنیـای شـیعر بـە گشـتی و بـە تایبەت شیعری کوردی کردووە، کە نە لە سـەرەتای ژیـانی ئـادەمیزادەوە تـا ئـەمڕۆ

کەس کردوویە و نەهەتا دنیا دنیا بێ کـەس خزمـەتی وای پـێ دەکـرێ‟ چـون ئەگـەر نیما لە فارساندا خۆی لە دەست قافیە و بەرابەریی بڕگـەکان رزگـار کـرد، مامۆسـتا ئێلخانیزادە بەوپەڕی لە خۆڕادیوی و لێزانیەوە، کۆت و زنجیری وەزنی لە مـل شـیعر داماڵیوە و خۆی لە جەغزی بەرتەسکی ماناشدا نەهێشتۆتەوە و بەو داهێنانە جوانە شۆڕشێکی گەورەی لە ئەدەبیاتدا پێك هێناوە و خۆی لـە دنیـای شـیعر و ئـەدەبدا نەمرکردووە.

ئەوانەی باسمان کرد هەموو بە نـرخ و جێـی رێـزن، بـەڵام بـە بـڕاوی مـن هیچـی ناگەنە فەرهەنگ و خودئاموز نووسیی ئەو مامۆستا بەڕێزە‟ کە لەو بـوارەدا گـەلێ کاری کردوون کارستان و پێموایە ئەوەنـدەی شـەو و شـەونخوونی لەسـەر کێشـاون کـە ئەگەر بە کیلۆ دووکەڵی چراشی نەخواردبێ، بێ شك گەلێ جار پسوولە برقی وای بـۆ هاتووە کە چەند بەرابەری داهاتی کتێبەکانی بووە (ئەوەش بەڵگەیـەك بـۆ دمبەسـت کردنی ئەو کەسانەی دەڵێن کـاك مسـتەفا بـۆ تـەماحی دنیایـە کتێبـان دەنووسـێ و مەبەستی خزمەت نیە).

من لێرەدا باسی خودئامووزە کوردیەکـەی ناکـەم کـە سـەتی نـەوەتی خـەڵك بـە خوێندنەوەی فێری کوردی بوون و لە کام کوێرە دێ لاپەڕە، پیرێژنێك نابینی بەرگێکی بە دەستەوە نەبێ و بەدەم تەشی رستنەوە متاڵای نەکا‟ بەڵکوو دەمهەوێ باسی ئـەو خودئاموزە تورکیە بکەم کە بۆ هەموو کەس لە بەرگی رۆژ و نانی شەو واجبتـرە و جێی خۆیەتی هەموو ماڵێك بـە پێـی سـەر بیکـڕن و بیکەنـە نوشـتەی باغـەڵ و لـە سەفەر و حەزەردا رەفیقی گیانی گیانیان بێ و سەعاتێك لە خۆیانی دوور نەخەنەوە و بەهانە نەگرن کە ئەو کابرا کەڕە کووردە تورکیی لە کـوێ زانیـوە؟ و لـە شـك دابـن‟ بلێبی هەڵە و پەڵەی کەڵەی تێدانەبێ؟ نا، من پێموایە قەڵەمی ئەو هێژایە مۆجزەیە و دەس بۆ هەر کارێکی بەرێ بە هاسانی بە دەستیەوە دێ و ئەگەر بە جێی خودئاموز و فەرهەنگی تورکی، بیهەوێ دەست لە خودئاموز و فەرهەنگی ئەڵمانی و رووسـیش

بوەشێنێ، هیچ جێگای شك و گومان نیه وەكوو فەرهەنگه توركیەكە تێیاندا سەردەكەوێ" با پیتێكیش رووسی و ئەڵمانیی نەخوێندبێ.

رەنگە بڵێن باشە خودئامووزی توركی بە كاری چیمان دێ؟ و بۆ چمانە؟ برایان بێ ئینساف مەبن! برایان زەحمەتی خەڵك بێ بایەخ مەكەن و بە فیڕۆی مەدەن! برایان ئەدیب و ویژەوانە خۆماڵیەكان بە كەم مەگرن و بە چاوی سووك تەماشایان مەكەن! بۆ تا ئەو مامۆستایە ئەو فەرهەنگە كامیلە و ئەو خودئامووزە توركیەی نەنووسیبوو كامتان دەوزانی، «یوورم یەسەن» بە ماندوونەبینی دەڵێن بەو زمانە و «نەوار نەیۆخ»، چاك و خۆشیی عەجەمانە؟ نا كڵاوی خۆتان بكەنە قازی و لە دین لامەدەن، كێهاتان دەوزانی، قامك لە چاوی من رۆكەن!

١٣٧٦

بەراوەردێکی (زانستی ـ ئەدەبی)ی

# دیوانی حافز و تەوژمی خەیاڵ

خواجە حافز، خودا قەبری پڕکا لە نوور، شاعیرێکی گەورە بوو" یەگجار گەورە" گەورەتر لەوەی ئێمە بیری لێ‌دەکەینەوە. تەنانەت بە نەزەری شەخسی خۆم، هێندێك جار لە غەزەلدا، وەپێش مامۆستا ئاسۆش کەوتووە. ئەوەندەی گڵ لەسەر قەبری حافزە، سەد ئەوەندە عەمری ئاسۆ بێ.

رەنگە دوای بڵاو بوونەوەی ئەو وتارە، زۆربەی هەرە زۆری رەخنەگران هورووژمم بکەنە سەر و بە نووکی قەڵەم و تەوس و تانە چاوم بکۆڵن، کە: ئەو فتوایەت بۆ داوە و پێی کافر بووی و بەڵایەکم بە سەر بێنن، سنەیی بە سەر بۆرەکەیی نەهێنابێ و قازی ئەو دەردەی بە حامیدی نەدابێ. بەڵام من باکم نیە" چون هیچ قسەیەك بێ بەڵگە ناکەم و بۆ هەموو ئەو ئازیزانە وەڵامم هەیە.

رەخنەگران رەنگە هەوڵ رەخنەیەکی بیگرن و مامۆستا ئاسۆی پێ لە ژوورووی حافزەوە دانێن، ئەوە بێ کە مامۆستا ئاسۆ لە زۆربەی شیعرەکانی‌دا مەدحی دۆست و رەفیقانی کردووە و ئەوانی بەو کارەی هەتا هەتایە لە لاپەڕەی مێژوودا هێشتۆتەوە" کارێکی بەداخەوە خواجە حافز خۆی لێ بواردووە و رەخنەگران ئەوە دەکەنە بەڵگەی ئەمەگ نەناسی و سپڵەیی خواجە حافز، دەرهەق بە دۆست و هەواڵانی و دەڵێن ئەوە نیشانەی دڵڕەقی و بێ هەستیی خواجە حافزی رەحمەتیە.

برایان، بە بڕوای من ئەگەر لەو بوارەدا خواجە حافز کەمتەرخەمیی کردووە، جێی لۆمە نیە و ناکرێ لەبەر ئەو ئیرادە ـ هەر چەند بە ئیرادێکی یەگجار گەورەشی دەزانم ـ دیوانە خشپیلانەکەی تووورِ هەڵدەین و تووك و نزای لێ بکەین. نا" حافز کە ئەو کارەی نەکردووە، رەنگە دۆست و هاواڵانی شیاوی پێ هەڵکوتن نەبووبن" دەنا ماڵم هەقە ئەو حافزە بەهەستەی من بیناسم، درێغیی نەدەکرد. بۆ وێنە یەکێك لە پاشاکانی سەردەمی بە نێوی «شێخ بوو ئیسحاقی ئینجوو»، کە بە شاهیدیی مێژوو

پاشایەکی عادڵ و دادپەروەر بووە و لەگەڵ حافز دۆستایەتیەکی نزیکی بووە و بە دەست «ئالی موزەففەر»ی زۆردار، ناپیاوانە لە ناو چووە، لە دیوانەکەی خواجەدا غەزەلێکی بە سۆزی پێ هەڵکوتراوە.

رەنگە هێندێك كەس بڵێن: بۆ خواجە حافز، بەسەرهاتی خۆی، بە قەولی فەرەنگیەکان، (Auto Biography) لە سەرەتای دیوانەکەی نەنووسیوە. ئەو کارەی مامۆستا ئاسۆ، بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە هەراوە لە ئەدەبی کوردیدا، دڵسۆزانە زەحمەتی کێشاوە و ئەنجامی داوە.

من پێم وایە حافز لێرەشدا تاوانی نیە. چون ئەو لە کاتی ژیانیدا شاعیرێکی ئاوەها ناسراو نەبووە کە خەڵك تینووی خوێندنەوەی بەسەرهاتی بن و بیانهەوێ بزانن لە کوێ لە دایك بووە و کوڕی کێیە و تەمەنی چەندە و چکارەیە و دەر و جیرانی کێن و... یا خود لە ژیانیدا خاڵگەلێکی وا بەرچاوی شك نەبردووە کە شیاوی نووسین بێ. دەنا بێ گومان ئەویش بەسەرهاتی خۆی (Auto Biography) دەنووسی.

هێندێك كەس رەخنە لە حافز دەگرن کە: بۆچی لە کاتی ژیانیدا وەك مامۆستا ئاسۆ، شیعرەکانی کۆ نەکردۆتەوە تا لە فەوتان رزگاریان کا و نەهێڵێ بە لە ناو چوونیان ئەدەبی گەلەکەی لاواز بێ.

خۆشەویستان، من پێموایە حافز لەو بوارەشدا تاوانبار نیە. چون ئەو نرخی شیعرەکانی نەزانیوە و پێی وانەبووە هێندە جوان و شیرین و نایابن، خەڵك دەیانکەنە نوقڵی مەجلیس و دیوەخانان. بۆ بەڵگە تەنانەت لە کۆتایی غەزەلێکدا، شیعری خۆی بە شیعری «خواجووی کرمانی» شوبهاندووە،کە دیارە نیشانەی ئەوەیە حافز نەیزانیوە شیعرەکانی ئاوا بایی‌دارن تا کۆیان کاتەوە.

هێندێك كەس رەخنە لە حافز دەگرن کە: بە زیندی سەر شیعرەکانی نەداوە بە خەتاتان، تا بە خەتی جوانی نەستەعلیق، کە بە بووکی خەتە ئیسلامیەکان نێوبانگی دەرکردووە، بیاننووسنەوە، ئەو کارەی مامۆستا ئاسۆ، دڵسۆزانە هەولی بۆ داوە و شیعرەکانی سەد هێندە پێ جوانتر کردووە.

برایان، ئەووەڵەن خەتی نەستەعلیق نزیکەی دووسەت ساڵ دوای حافز بەدی هاتووە. دوامینی ئەوەش ئەگەر حافز شیعرەکانی نەداوە بە شێوە خەتەکانی باوی ئەو زەمان بیاننووسنەوە، دیسان دەگەڕێتەوە سەر بێخەبەر بوون لە بایەخی شیعرەکانی و دیارە نەیزانیوە چ خەزێنەیەکی نایافتی بۆ نەتەوەکەی وەسەر یەك ناوە تا شایی پێی بێ و بە دەوریدا بێ و تیفتیفەی بدا و بیڕازێنێتەوە.

هێندێك لە رەخنەگران دەڵێن: بۆ خواجە حافز نەدەچووە لای وێنەگەرێك، وێنەیەکی بکێشێتەوە تا «محەممەدی گوڵەندام»، دوای کۆ کردنەوەی شیعرەکانی، رووبەرگ و لاپەڕەی هەوەڵی دیوانەکەی پێ بڕازێنێتەوە و خەڵك لە دینی روخساری بێبەری نەبن" ئەو کارەی مامۆستا ئاسۆ بە دڵێکی ئاوەڵاوە کردوویەتی.

برایان، خۆ سەردەمی حافز وەکوو ئێستە نەبووە، هەر شارەی و تەنانەت هەر گەڕەکەی شەش حەوت وێنەگەری تێدابێ. ئەو دەم وێنەگەر تەنیا لە چین و ماچینان بووە و رەنگە حافز دەستی پێی رانەگەیشتبێ. جا یا لەبەر ئەوە بووە کە حافز زۆر خانەگی بووە و لە ماڵێ دوور نەکەوتۆتەوە، یا خەرجی سەفەری نەبووە، یان پەیوەندیی دیپلۆماتیکی دەوڵەتی ئالی موزەففەر دەگەڵ بلووکی رۆژهەڵات ناکۆك بووە و ویزای چین و ماچینانی بۆ وەرنەگیراوە. یان ئەگەر دەستیشی پێی راگەیشتبێ، وێدەچی حافز پیاوێکی رووبازاڕی نەبووبێ و پێی خۆش نەبووبێ وێنەکەی بڵاو بێتەوە، کە ئەو مەسەلەیە تا ئێستا لە تاریکیدا ماوە و روون نەبۆتەوە.

ئەوە هۆی کەمتەرخەمیی حافز، بەڵام مامۆستا ئاسۆش لەو بوارەدا بێ تاوان نیە. چون ئەمڕۆ سەردەمی حافز نیە و وێنەگر و کەرەسەی وێنەکێشی بە پێی فیلانە و بۆ وەدەست هێنانیشی کاڵە و گۆچاوی ئاسنی ناوێ. کەچی ئەو بەڕێزە چرووکیی بە خەرج داوە و بۆ کتێبێکی سەت و چل و پێنج لاپەڕەیی، تەنیا دوو وێنەی چاپ کردووە. کە بە بڕوای من ئەگەر حەوسەت ئەکسیشی پێ زۆرە و دەڵێ خەرج زۆر هەڵدەگرێ، دەبوو لانی کەم لاپەڕەی چوار ئەکسی لێ چاپ کردبایە" کە بە داخەوە

نەیکردووە. جا من پێموایە ئەگەر ئێمەش لێی خۆش بین، بێ شك بەرەی داهاتوو لەبەر ئەو کەمتەرخەمیە نایبەخشێ.

هێندێکی تر لە رەخنەگران دەڵێن: لە غەزەکانی مامۆستا ئاسۆدا جوانکاریگەلێك کراوە کە لە دیوانی حافزدا نەدیتراوە. ئەوان دەڵێن: دیوانی حافز، «چزچز و خزخز»ی بۆ دەمان لێ وەگیر ناکەوێ. ئەو برایانە راست دەکەن، بەلام با ئەوەشمان لەبەر چاو بێ کە شیعری حافز سەدەی هەشتەم کوتراون و شیعری مامۆستا ئاسۆ سەدەی چاردە" دیارە شیعریش وەك هەموو بەشەکانیتری هونەر ، هەر دێ و بەرەو پێشەوە دەچێ و هەڵسەنگاندنی شیعرێك دەگەل شیعری شەشسەت ساڵ لەوە پێش بە پێوەرێکی بەرابەر، درووست نیە. سەرەرای ئەوەش، بە چیرا دیارە حافزیش شیعری ئاوا جوانی نەکوتبێ و کۆ نەکرابێتەوە و ون بووبێ؟ یان شاعیرێك! لێی زەوت کردبێ؟ ئێمە لە تاریکیداین. خودا عالمە.

هێندێك کەس رەخنە لە حافز دەگرن کە: مێژوو و شوێنی کوتنی شیعرەکانی دیاری نەکردووە. ئەو کارەی مامۆستا ئاسۆ بۆ سوودی توێژکارانی بەرەی داهاتووی ئەدەب و وێژەی گەلەکەمان، وشیارانە ئەنجامی داوە.

برایان خواجە حافزی کڵۆڵ ئەگەر ئەو کارەی نەکردووە، جێی لۆمە نیە و هەقمان نیە لووتی لێ بادەین و بە تاوانباری بزانین. چون ئەودەم وەك ئێستا دیاری کردنی شوێن و مێژووی لە دایك بوونی شیعر باو نەبووە و شاعیران زیاتر وەدووی عیرفان و سۆفیگەری کەوتوون و هێندە بە تەنگ ئەدەبی نەتەوەکەیانەوە نەبوون و نەیانزانیوە، مەعلووم نەبوونی شوێن و مێژووی شاکارێك، چ زەبرێکی کاریگەر لە پەیکەری ئەدەبی نەتەوەکەیان دەدا. ئەگەر چی لەو بوارەدا مامۆستا ئاسۆش کەمتەرخەمیی بە خەرج داوە و تەنیا بە نووسینی رۆژی کوتنی شیعر و شار یا گوندێك کە تێیدا کوتوویەتی، کیفایەتی کردووە. کە بە بڕوای من دەبوو بۆ تۆمار کردنی زەمان، ئەگەر سانیە وثانیەی هاتنی شیعرەکانیشی نەدەنووسی، لانیکەم سەعات و دەقیقەکەی تۆمار کردبا و هەروەها لە نووسینی شوێنی کوتنی شیعرەکاندا، گەرەك

و کـۆڵان و ژمارەکاشـی و دیـوی نووسـینی ئـەوانی دیـاری نـەکردووە کـە ئـەوە بـە کـەلێنێکی بەرچـاو دەزانم لـە ئـەدەبی کـوردیدا، چـون لـە داهـاتوودا دەبێتـە هـۆی سەرلێشواویی وێژەی گەلەکەمان و زەرەر و زیانی قورسی قەرەبوو نابێتەوە.

هێندێك کەس دەڵێن، مامۆستا ئاسۆ لە ماوەی پازدە ـ بیست ساڵ شـاعیریدا، بە قەت پەنجا ساڵی حافز، شیعری کوتووە و ئەوە دەکەنە بەڵگەی پاراوتر بوونی زمان و زەوقی مامۆستا ئاسۆ لە حافز.

برایان من هەرگیز ئینکاری ئەوە ناکەم کە لە هەموو بەشێکی هونەردا دەست باڵای دەست هەیە. بە تایبەت لەو بەشانەی زگماك و خودادادین. غایـەتێکـی مـن هۆی ئەوە کە خواجە حافز وەك مامۆسـتا ئاسـۆ پـڕ شـیعر و دم پـاراو نیـە، لـەوەوە دەزانم، کە لە سەردەمی ویدا رۆژنامە و گۆڤار، کە هانـدەرێکی بـە هێـزی ئـەدەبین، وەك ئێستا زۆر و زەوەند نـەبووە. ئـەو دەم تـەنیا گۆڤارێـك لـە شـیراز دەرچـووە کـە ئەویش زۆربەی لاپەڕەکانی بە شیعری «شاشـوجاع» و شـاعیرە دەرباریـەکانی دەور و پشتی رەش دەبۆوە و حافز سـاڵە و سـاڵیش شـیعرێکی بـۆ چـاپ نـەدەبوو. تەنانـەت لەبەر ئەو بێ مەیلیە، ماوەی چەند ساڵێك لەسەرەتای دەرچـوونی گۆڤارەکـەدا لێیـان زیز ببوو و هەر شیعری بۆ نەدەناردن.

هێندێك کەس دەڵێن: بۆ حافز بە زیندی سەر نێوێکی وەك کتێبـە بەنرخەکـەی* مامۆستا ئاسۆ (تەوژمی خـەیاڵ) خـۆش و دڵـڕفێنی بـۆ دیوانەکـەی دانـەدەنا. چـون (دیوان) نێوێکی گشتیە و دیوانی فلانەکەس، وەك بانگ کردنی کەسێك وایە کە پێی بڵێن: کوڕی فلانەکەس و نابێتە نێوی تایبەتی.

ئەو برا خۆشەویستانەی کە ئەو رەخنەیە لە حافز دەگرن، دەبێ ئەوەیان لەبەر چاو بێ کە سەردەمی حافز، هێشتا کتێبەکەی «مامۆستا هێدی» چاپ نەببوو.

هێندێك رەخنەگری وردبین دەڵێن: حافز لە شیعرە عەرەبیەکانیدا نازنـاوی جیـای نیـە" کەچـی مامۆسـتا ئاسـۆ بـۆ شـیعرە فارسـیەکانی، ناسـناوەکەی وەرگێـڕاوە و کردوویەتە (افق). هەروەها دەڵێن: حـافز تـەنیا لـە ئـاخری غەزەلـەکانیدا ناسـناوی

هێناوە، کەچی مامۆستا ئاسۆ لە دوای هەموو جۆرە شیعرێك بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە، شیعرەکە بە نازناو برازێنێتەوە و ئەوەیان لە حافزدا بە ئیراد گرتووە.

لە وەلامی ئەو بەرێزانەدا دەبێ بلێم: لە حاند قسەی هەق ئەستۆم کەچە.

لە کۆتاییدا، قسە هەزارە و دوانی بەکارە. من بەش بە حالی خۆم، هەموو عالەم لۆمەم کا و بە بێزەوقم لەقەلەمدا، هەر شیعری حافزم پێ لە شیعری مامۆستا ئاسۆ خۆشترە. ئەوەش بڕوای خۆمە و بڕوای کەسیش ئایەتی قورعان نیە و بۆی هەیە راست بێ یان چەوت. ئێوەش کەیفی خۆتانە.

جۆزەردانی ٧٦.



$ کتێبەکە بایی دووسەتمەنی عەلەن تەواوە و ئەگەر دەست فرۆشان دەیدەن بە پەنجا تمەن، بۆ بووژاندنەوەی ئەدەبی کوردی و بەربەرەکانی دەگەڵ گرانفرۆشیە و بەس.

# تەنزێکی تاریخی

لە مێژ بوو لە خوێندنەوەی سروە تەرەببووم" خەتە خرپنەکەی چاوی ئازار دەدام، بە وت و وێژە کۆپیە پووچەڵەکانی دڵم لە بوورەوە دەچوو و شێوەکاریە شل و شەوێقەکانیم سارد و بێ گیان دەهاتە بەرچاو و وەبەر دڵم نەدەکەوتن و لەو هەموە کاریکاتۆڕە کۆپینی و ئاوەڕۆییە وەڕەز ببووم و بێزم هەڵدەستا. (ئاخر بۆ مەگەر دنیا چ گیر و گرفتی تری تێدانیە کە کاکی کاریکاتۆڕیست لە کۆڕی کۆپین و رەهەندی ئاوەڕۆ نایەتە دەر؟) تا خوداو راستان لە سروەی ژمارە ٢١٤ دا چاوم بە وتاری «هەوشار؟ یان حەوشاری مێژوویی؟» مامۆستا عومەری فاڕووقی و برادەرێکی مەجووسی بە نێوی (زەڕدەشت ئاوێستایی) کەوت، کە بە دوو قۆڵی نووسیویانە و بە خوێندنەوەی گەشامەوە و لە وێڵ بوون بە دووی وتاری بەکەڵك و شیرن، حەسامەوە.

هەر چەند ئەو برادەرە مەجووسیەی دەگەڵ مامۆستا فاڕووقی وتارەکەی نووسیوە پیاوێکی نەناسراوە و لەوە پێش چمان لێ نەدیبوو، بەڵام کاك عومەر خۆی پیاوێکی نێو بە دەرەوەیە و گەلێ وتاری مێژوویی لە گۆڤارە کوردیەکان چەپاندووە! و کەم سیلسیلە ماوە جەدد و ئابادیانی تێك نەکردبێتەوە و بنە و بنەچەکی دەر نەهێنابن و بەزۆری بێ و بە خوایشت، بە خوێنەرانی نەناساندبێن.

هەڵبەت ئەو وتارەی مامۆستا فاڕووقی و برادەرە مەجووسێکەی، دەگەڵ وتارەکانی پێشووی کاك عومەر جیاوازە و لێرەدا ئەو بەڕێزانە راستەوخۆ باسی مێژوو ناکەن کە تێیدا پسپۆڕ و شارەزان. بەڵکوو وتارەکە رەخنەیەکی زانستیانەیە بە شێوەی تەنزێکی شیرن، لە کاری هێندێك بە نێو مێژوو نووسی بێمایەی ناشارەزا کە کاریان بە جێی روون کردنەوە، هەتڵە کردن و سەرلێشێواندنە و بە وتاری بێ سەروبنی رەمەکی، مێژووی گەلەکەمانیان چەواشە کردووە.

جا با زۆری لەسەر نەڕۆین و ئێمەش بە دەردی ئەوان! نەچین و بێینەوە سەر خەت.

مامۆستا فاڕووقی و برادەرە مەجووسێکەی هاوڕێی، بۆ وتارەکەیان نۆ لاپەڕەی قەبارە رەحیلیی گۆڤاری سروەیان بە پیتی وردی رۆژنامەیی رەش کردۆتەوە کە نۆ رستەی تێدا نیە روون کەرەوەی پرسیاری تیتری وتارەکە، (هەوشار؟ یان حەوشاری مێژوویی؟) بێ و بەو شێوە لاساکردنەوەیە، تەوەس و توانجیان گرتۆتە ئەو بە نێو مێژوو نووسە ناشارەزا و بێ مایانە کە هەر بە قەت حەمەی ئاشەوان لە مێژوو دەگەن و بە وتارە دوور و درێژە مێژووییەکانیان مێشکی سەری خوێنەر دەبن، بەلاّم ئەوەی باسی نەکەن، مێژوو و روون کردنەوەی مێژووییە.

(لێرەدا دەبێ بلێّم کە: لێم سوورە ئەو وتارە نۆ لاپەڕەییە، لانیکەم نۆ لاپەڕەی تریشی بارستا بووە و مقەستی کاکی ویراستاری ناپسپۆڕ، وەك مێورەی بەهاریێ هەلّی پاچیوە و بەو شێوە ناشیانەیە باری تەنزی وتارەکەی کز کردووە. کە تکا دەکەم لەمەودوا ئەو وتارە شیرنانە سەقەت نەکەن و بە خڕوپتوونی بیخەنە بەرچاوی خوێنەری تامەزرۆ.)

بێ گومان لە هەر سەر دەمێكدا وەکوو هەموو بەشەکانیتری کۆمەلّ، مێژوونووسی ماستاوچیش هەلّدەکەون کە وەك گولّەبەرۆژە دەگەلّ دەسەلاّت دەگەڕێن و لە پێناو بەرژەوەندیی ئەوان، بۆ خۆشیرن کردن چاو لە سەرەکیترین بنەماکانی مێژوو نووسی، یانی هەق ویژی و راستگۆیی، دەقووچێنن و راستیەکانی مێژوو وەپشت گوێ دەخەن و دەیشارنەوە. هەر بۆیە مامۆستا فاڕووقی و رێزدار زەردەشت ئاوێستایی، لە باسی کوشتاری مەزدەکیەکانی سەردەمی سانسانیەکان! لەو جۆرە مێژوو نووسانە لە قاو دەدە ن و بەتەوەسەوە تێیان رادەخۆڕن و دەلّێن: «چلۆن دەبێ بیستهەزار کەس میوان بگرن و سەریان لێ بدەن بەلاّم ئەو بیست هەزار کەسە، تەنانەت بیستهەزار جنێو نەدەن، یان شەقێ لەکەس هەلّ نەدەن؟» دیارە هەر وەکوو مامۆستایان بۆی چوون و شوێنیان هەلّگرتووە، ئەو بیست هەزار کەسە، بیستهەزار

سەهلە، چلهەزار جنێویشیان داوە و رەنگە زۆر کەسیشیان وەبەر شەق دابێ. بەڵام وێدەچێ یەکێك لەو کەسانەی وەبەر شەق کەوتبێ، مێژوو نووسی تەشی رێسی سەردەم بووبێ. بۆیە پێی قارِ بووە پێ لە عەیبی خۆی بنێ وراستیەکە بدرکێنێ.

ئیرادێکی دیکەی کە مامۆستا فارِووقی و برادەرە مەجووسیەکەی هاورِێی بە تەنز دەست نیشانیان کردووە و بەو شێوەیە لە مێژوو نووسە ناشارەزاکانیان لە چەپلەداوە، ئەوەیە کە بە لاساکردنەوەیان وشەی غەلەت و هەلەیان لەکار کردووە.

هە وەکوو دەزانین بناغەی تەنز لەسەر گۆرِینی باوەکانە و بەرِێزان مامۆستا فارِووقی و کاك زەرِدەشت ئاوێستایی وتارەکەیان بە وشەی غەلەت لیپ داوە و بەو جۆرە، بە گۆرِینی باو، تیر و تانەیان هاویشتۆتە مێژوو نووسانی ناشارەزا و کوردی نەزان. هەڵبەت باو وایە کە کابرای تەنز نووس، لەپێش هەر وشەیەکی غەلەت، نیشانەیەکی سەرسوورِمان (!) دانێ. بەڵام چون وتارە دووقۆڵیەکەی ئەو مامۆستایانە غەلەتی لە رادە بەدەرە، دانانی ئەو هەموو نیشانەیە لە پێش وشە غەلەتەکان دیمەنی وتارەکەی ناحەز دەکرد. بۆیە نوێکاریان بە خەرج داوە و نیشانەیان بۆ دانەناون. (شایانی باسە هێندێك کەس لەسەر ئەو برِوایەن کە ئەو هەمووە غەلەتە بە ئانقەست نیە و هۆیەکەی بە کوردی نەزانینی کاك زەرِدەشت ئاوێستایی دەزانن" کە دەبێ لە مەجووسێکانی «شەریف ئاوای یەزد» بێ. بەڵام ئەو کەسانە بۆ خۆیان لە هەڵەدان، چون لەگەڵ تەنز و شێوە جۆراوجۆرەکانی ئاشنایەتیان نیە.)

مامۆستا فارِووقی و برادەرە مەجووسیەکەی (کاك زەرِدەشت ئاوێستایی) لە تەنزە شیرنەکەیاندا، هەڵەیەکی زەقی تری مێژوو نووسە چەپرەکەکانیان دەست نیشان کردووە کە بە جێی لێکۆڵینەوەی زانستی و پەیدا کردنی بەڵگەی باوەرِ پێکراو، دێن قسەی کابرایەکی هاوچەرخ یان نووسراوێکی ئەو سەردەمە دەکەنە بەڵگەی بابەتێکی چەند هەزار ساڵ لەوە پێش. هەر بۆیە ئەو بەرِێزانە، بە تیر و تانە هێناویانە لاسایان کردوونەوە و نموونە شیعری مامۆستا قانعیان کردۆتە بەڵگەی هەورامی بوونی کتێبی ئاوێستا و نموونە شیعری «مامۆستا حەقیقی»شیان بۆ سەلماندنی کوردی بوونی

وشەکە هێناوەتەوە. کە دەستیان خۆش بێ، تەنزێکی بەقەوەت و کەم وێنەیە و پیاو ئەوەندەی پێ پێدەکەنێ زگی دێشێ.

هێندێك مێژوو نووسی لاپرەسەنی ناشارەزا، بە جێی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی و لێکدانەوەی ئاڵ و گۆڕی پیتی وشەکان بە شێوەیەکی زانستی، دێن رەمەکی هەر وشەیەکی کۆن برێك شێوەی وشەیەکی تازەی دا، بە زەبری سوێند و کوتەك لە مل یەکیان دەپەستێون و دەڵێن: ئەها، ئەوە هەمان وشەیە و بە درێژایی مێژوو ئاڵ و گۆڕی بەسەردا هاتووە. جا بۆیە مامۆستا فارووقی و هاورێ مەجووسیەکەی چەندین وشەی کۆنیان ریز کردووە و بە تەوس، هەر یەکەی بە کەیفی خۆیان هەمبەرێکی نوێیان لەپەنا داناوە. وەکوو: کیقوباد = کاکۆباد " انوشیروان= نێچیرەوان " ساسانی= سانسانی، لە سەر کێشی خانخانی و مەمانی. بەلام لە هەموان خۆشتر لێكدانەوەی وشەکانی (ئێران و توران)ە کە بە لاسای مێژوو نەناسەکان، بە تەشەر کوتوویانە لە ئێرەیی و تۆران وەرگیراون. کە تەنزێکی بەقەوەتە بۆ دەمکوت کردنی ئەو جۆرە کەسانە. هەر بۆیەش لەو باسەدا وشەی پاچەقاندنیان! دەکار کردووە کە جێی خۆیەتی و پڕ بە پێستیانە. هەڵبەت لێرەدا مامۆستایانی هێژا بۆ وشەی (توران ⇦ تۆران) گۆرانیی «بۆ تۆرت کرد بۆ تۆریای؟ هەگوڵە لەسەر چی تۆریای» شیان وەك بەڵگەیەکی مۆسیقای مێژوویی هێنابۆوە و شەرحیان کردبوو کە بە داخەوە ویراستاری بێ ئینساف هەڵی پاچیوە.

هێندێك نووسەری بێسەواد، کە کوردیەکە بە باشی نازانن، بۆ خورانان هەڵدەکوتنە سەر زمانە لاوەکیەکان و وشەی لاوەکی و لاتین لەوتارەکانیان دەخەن. تا خەڵك بە زمانزان و شارەزایان لە قەڵەمدا. کە دیارە کابرا زمانەکەی خۆی نەزانێ، لە زمانی بێگانەدا هەرە لە برە ناکاتەوە و تووشی هەڵە و غەڵەت دەبێ. هەر بۆیە مامۆستا فارووقی و رێزدار زەردەشت ئاوێستایی، بە لاسای ئەو جۆرە کەسانە، بە تەوس وشەی (Symbol) یان بە (سونبول) نووسیوە و بەمجۆرە پێیان حاڵی کردوون کە ئێوە لە پێشدا زمانەکەی خۆتان فێر بن، دوایە بچنە زگ! زمانێکیتر. هەر وەها

دەکارکردنی وشەی سونبول (کە نێوی گوڵێکە) بە جێی سەمبول، ئیشارەیەکی شاراوەیە بۆ دەستەگوڵ بە ئاودادانی نووسەرە ناشیەکان.

ئەو قەدەرە بە داخەوە بەعزە نووسەرێك بە تایبەت مێژوونووسە پڕکارەکان، فێر بوون لە سەر تەلەفیزیۆن و لە وتاری گۆڤارەکاندا، لە جەنگەی باسە مێژووییە گرینگەکانیان، دەکوڕووزێنەوە کە: دەستمان دەرەقەتی دمان نایە. یانی ئەوەی دەیبێژین، ئەوەندەمان دەست ناڕوا چاپی کەین کە ئەو کوڕووزانەوەیەش خۆی لە خۆیدا پەتایەکی ناحەزە، چون هەم دەگەڵ باسە مێژووییەکان ناگونجێ و هەم نووسەریشی پێ سووك دەبێ. هەر بۆیە مامۆستا فاڕووقی و هاوڕێ مەجووسیەکەی، لە نێو چەقی وتارەکەیاندا، بە هێنانە گۆڕی ئەو باسە، بە زمانی تەنز دە ئامپاکانیان گەیاندووە کە ئەو کوڕووزانەوەیە ناحەز و نابەجێیە تا بەڵکوو تەرخی کەن و لەوە بەدوا نەچنەوە سەری.

هێندێك مێژوو نووسی ناشارەزا، ئەوەندە ناشین کە بۆ خۆیان لە خۆیان لە هەڵڵا دەدەن و بە لەبەرچاو نەگرتنی شوێن و زەمانی رووداوەکان، هەڵەی وادەکەن پیاو پێی بە عەرزەوە رەق دەبێ. ئەوانە گەلێ جار بە سەدان ساڵ و فەرسەخ، بە سەر زەمان و زەویدا بازدەدەن، بەڵام چون دوعای بە خێری خەڵکی ئەمەگناسیان بە دواوەیە، نە قاچیان دەشکێ و نە ملیشیان ورد دەبێ. هەر بۆیە مامۆستا فاڕووقی و برادەرە مەجووسیەکەی تەوس و تانەیان تێ گرتوون و بە گەپ لاسایان کردوونەوە و کەشتیەکەی نووحیان کردۆتە (دەفری باڵدار) و هاوکات لە ئارارات و چیای شەنگاڵ و شێخان دایان بەزاندووە، کە بە سەدان کیلۆمیتر لێك دوورن. هەروەها فەرموویانە: دەفرە زێڕینەکەی تەپکی حەسەنلوو، بە نەخشی دەورانی ماد و هەخامەنیشی رازاوەتەوە. کە ئەو جامە ئاڵتوونە چەند سەد ساڵ بەر لە ماد و هەخامەنیشیەکان سازکراوە و شتی وا ناگونجێ" مەگەر زێرینگەرەکەی کەرامات دار و داهاتووبین بووبێ.

زۆر مێژوو نووسی لابەلا هەیە کە وتارەکانیان هەموو قسەی هەڵیت و پڵیت و بێ سەر و پایە و عاسمان و ڕێسمان لێك دەبەستن و لەو پێجێیەی فەرزەن باسی چەند

هەزار ساڵ لەوە پێشی چین و ماچینمان بۆ دەکەن، بێ عوزر و بەهانە بە پڕتاو هەڵدەکوتنە سەر ئەوڕۆی ئەمیرکە و کانەدا. هەر بۆیە مامۆستا فارووقی و هەواڵە مەجووسیەکەی لە باسی هەوشارەوە هەڵیانکوتاوەتە سەر ئاوێستا و زەند و پازەند و تەقلە کوت گەڕاونەتەوە گۆنگرەکەی بێسارانی لە مەریوان و دیسان وەسەر شاشەی مێدیا پەڕیون و خۆیان کوتاوەتە نێوگوت و بێژی بابان سەقزی و بەو تەنزە شیرنە مانادارە، مێژوونووسە چەپرەکە ناحاڵیەکانیان حاڵی کردووە کە: براگیان هەرکارەی شێوازێکی هەیە و وتاری مێژوویی و مەنجەڵی رۆژی جێژنی کابرای مجێور یەك نین. لێرەدا نووسەرانی خۆشەویست داخ وکەسەریان هەڵڕشتووە کە بابان سەقزی لەسەر تریبۆنی مێدیا مەجالی دەربڕینی مەبەستە مێژووییەکەی نەبووە. کە بە بڕوای من ئەو داخ و کەسەرەی نەدەویست. چون ئەگەر تریبۆنی مێدیا وەختی بە دەسندەیە، خۆ لاپەڕەکانی سروە لە پەرێزی پایز بەرەڵاترە" دەی با ئەویش لە وێدا مەبەستی خۆی دەربڕێ.

هەروەکوو ئاگادارین بناغەی کاری مێژوویی لەسەر بەڵگە و سەرچاوەی باوەڕ پێکراوە و ئەگەر وتار، یان کتێبێکی مێژوویی سەرچاوەی نەبێ، کەس بە هێندی ناگرێ و تووڕێکی تەڕی پێ نادا. هەر بۆیە مامۆستا فارووقی و کاك زەردەشت ئاوێستایی بە تەوس و تانە لاسای ئەو کەسانەیان کردۆتەوە کە لە نووسینی بابەتی مێژوویی‌دا بنەمای سەرەکی لە بەر چاو ناگرن و سەرچاوە دیاری ناکەن. جا هێناویانە وتارێکی بە دەسنووس هەژدە و دوای ویرایشی ویراستار نۆ لاپەڕەییان لەسەر مێژوو نووسیوە و بۆ نموونە ـ دەستم لەگەڵ دەستیان ـ تاقە سەر چاوەیەکیشیان دەست نیشان نەکردووە، تا بەشکم ئەو مێژوو نەناسە بێ چاو و ڕووانە بە خۆدا بشکێنەوە و حەیا بیانگرێ و لەوە بەدوا کاری ئاوا پڕوپووچ نەکەن.

لە کۆتایی‌دا لە خودای میری مەزن بۆ مامۆستا فارووقی و لە ئەهوورامەزدای میهربەخش بۆ کاك زەردەشت ئاوێستایی داوا دەکەم لەوتاری مێژوویی و تەنزی ئاوا شیرن و بەتام، سەرکەوتوویان کا و، گلەیی و گازندەی خۆشم لە ئەنجومەنی

زەردەشتیەکانی ئێران دەردەبڕم کە بۆ دووبەرەکیان کەوتۆتە نێو و کەمتەرخەمی دەکەن و سمینارێکی فەرهەنگی بۆ لێکۆڵینەوە لە مەبەستە مێژوویی و ئایینیەکانیان بۆ مامۆستا فارووقی و برا دینیەکەی خۆیان (رێزدار زەردەشت ئاوێستایی) هەڵنابەستن! خۆ کەبابە بەرخێکی یەزد و کووپەیەك شەربەتی! کۆنی خۆماڵی ئەوەندە خەرج هەڵناگرێ پیاو لە پێناویدا چاو لە فەرهەنگ و مێژووی نەتەوەکەی بقووچێنێ. ئەوەتا خودا دەست بە عەمر و زانستیانەوە بگرێ، ئێمە لەسایەی سەری ئەو مێژوو نووسانە، لە خودای بەزیاد بێ، هیچ کون و کاژێرێکی تاریخمان بە تاریکی نەماوەتەوە و مێژوومان ئەوەندە روون و ئاشکرایە، دەڵێی مێژووی شایە.

١٣٨٣

# زمانی ئۆردوو

- ئەحمەد!
- ..................
- ئەحمـــــەد!
- ..................
- ئەحمەده سوور!
- بەڵێ بەڵێ، ئەوە هاتم.
- سوورەسەگ، سەعاتێکە هەرات لێدەکەم لە کوێی بە ملی شکاوت؟ ها؟
- قوربان ببورە، لەو دیو بووم، ئاگام لێ نەبوو.
- ئەدی چت دەکرد بە گیانی ناخێرت؟
- قوربان خەریکی متالآی زمانی ئۆردوو بووم.
- زمانی ئۆردوو؟! زمانی ئۆردوو بۆ؟!
- وەڵاهی دەمەوێ فێری بم و چیرۆك و شت لەو زمانەوە وەرگێڕمە سەر کوردی. با هەر نەنووسن (وەرگێڕ لە فارسیەوە)، با جارێکیش بنووسن (وەرگێـڕ لـە ئـۆردۆوە) پیاو.
- جا باشـە، خودئـاموزێکی کـامیلی ئـۆردووت لـە لایـە؟ وەك ئـەو خودئـاموزە کامیلە کوردیانە؟!
- نەخێر.
- ئەی بە چی فێردەبی؟ بێ مامۆستا؟!
- وەڵا هەر پشتی ئەو شەمچە پاکستانیانە دەخوێنمەوە.
- ئاخر گێژ و حۆلی نەفام! پیاو بە پشتە شەمچە خوێندنەوە فێری زمان دەبێ؟!
- قوربان بۆ تووڕە دەبی؟ دە خەڵکیش هەر وەك منن ئیدی.

١٣٧٠

# فیلناسی

- ئەحمەد ئەوە چیە پێت؟
- قوربان ئەوە کتێبێکە بە نێوی «فیلناسی». کە بە پێویستم زانی بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێکیتر لە ئەدەبی نەتەوەکەمان وەریگێڕمە سەر کوردی چون بە راستی لە زانستی فیلناسیدا زۆر دواکەوتەین. ئەوە بەرگێکیشم بەدیاری بۆ هێناوی.
- بە خێر بێی، دەستت خۆش بێ یاخوا. ئەدی بۆ بەجێی ئەکسی فیل، وێنەی خۆت لە رووبەرگەکەی چاپ کردووە؟!
- قوربان هەموو کەس ئەکسی فیلی دیوە، ئەکسی خۆم لازمتر بوو، چون بەسەرهاتی خۆشم لە دە داوزدە لاپەڕەدا لێ نووسیوە، دەبوو ئەکسەکەشمی پێوەبێ.
- ئەدی نێوی نوسەرت بۆ وا چکۆلە نووسیوە و نێوی خۆت ئاوا گەورە؟!
- ئاخر ئەوەی زەحمەت بێ من کێشاومە، نووسەر بۆ وەڕەزی بە سەر بردن، شتێکی نووسیوە و خۆی ماندوو نەکردووە. بەڵام من تا وەرمگێڕا سەر کوردی، هێندەم وشەدان هەڵداوە، هەموو سەر قامکەکانم خوێنی لێ دەتکا.
- دەی باشە مبارەکە" ئەمر!
- وەڵڵاهی ئەگەر زەحمەت نەبێ، شیعرێکی پێدا هەڵبڵێ، لە چاپی دووهەمدا لێی دەنووسم.
- بەسەر چاو، بەڵام بەشەرتێك وێنەیەك و بەسەرهاتی منیشی تێدا چاپ کەی.

١٣٧٠

# ژینامه

- ئەحمەد! دا وەرە کوڕە ئەوە لە بەیانیەوە خەریکی چی؟
- قوربـان دیـوانی حـافزم دەخوێنـدەوە. بـەیتێکی ئەوەنـدە خۆشـی تێـدابوو سـەیر! شابەیتە! بۆتی بخوێنمەوە؟
- نا، لێی گەڕێ پێویست ناکا" وەرە سەرگوریشتەی ئەو شاعیرەم بۆ بخوێنـەوە، لـەو گۆڤارەدا چاپ کراوە. من چاویلکەکانم پێ نیە.
- بە سەر چاو: «لە زانینی ناوی شاعیردا، توێژینەرەکان رایان یەك نیە.ساڵی وەفات و لەدایك بوونیمان بۆ روون نـەبۆوە ...» قوربـان عـەجـەب شـیعرێك بـوو هـا! ئـەو شیعرەی خافز دەڵێم، شتی وام قەت نەدیوە!
- ئەرێ دەکرێ چـەنەت گـرێ دەی و بێـدەنگ بـی؟ دەڵـێم ئـەو ژینامەیـە بخوێنـەوە ژینامە!
- بەسەر چاو: «شوێنی لەدایك بوون و مردنی ئەو شاعیرە نادیارە ...» کوڕە قوربان ئەو شیعرە هەر سەیر بوو سەیر!
- کوڕە قوربان و ژەهری مار، کوڕە قوربـان و دەرد، ئـاخری وادەکـەی هـەم دیـوانی حافزەکەت بدڕێنم و هەم دوو زللەشت لە بنانگوێی راکێشم، ئەتۆ هێندە چەنە چەنە چیە دەیکەی؟ چت پێ دەڵێم ئەوە بکە!
- بەسـەر چـاو: «هـەر وەهـا نێـوی کتێبـەکانیمان بـۆ مـەعلووم نـەبووە و لـە شیعرەکانیشی چمان وەدەس نەکەوت دەنا بۆ نموونە لە چاپمان دەدا ... کوڕە، ...»
- باشە ئەحمەد باشە، ئەلحوکمولیللا، شیعرەکە بخوێنەوە بزانین ئەو شـاکارە چـیە وا ئاشقی بووی و هەراست بە عەمری هەڵگرتووین.
- شیعرەکە میسراعی هەوەڵیم لە بیرنیە" میسراعی دووهەمی دەڵـێ: نـازانم چـی و چی و چی حافـــــــــــــزا!

١٣٧٠

# غەزەلی حافز

- ئەحمەد! ئەو ورتە ورتەت لێ چیە؟ لێمان دەگەڕێی سەرخەوێك بشكێنین یان نا؟
- قوربان ببورە، ئەوە غەزەلێكی حافزم وەرگێڕاوەتە سەر كوردی، دەخوێندەوە.
- كوڕە شتی چا بڵێ! ئەتۆ و غەزەلی حافز؟! وشتر و گێرە؟!
- جا خۆ ئیشەڵڵا درۆت عەرز ناكەم، بە خودای واشم وەرگێڕاوە، دەبێ بێیە سەیری! دەڵێی بۆت بخوێنمەوە؟
- بیخوێنەوە دەی، دەزانم هەرشەڕی ئەوەت بوو من تێبگەیەنی.
- بە سەر چاو" شاعیر دەڵێ:
- «تەنت بە نازی تەبیبان نیازمەند نەبێ»

وجوودی نازوكت ئازوردەیی گەزەند نەبێ....»

- بەسە! بەس! ئەوە لە كوێ شیعر وەرگێڕانە بێسەواد؟! تەواوی وشە فارسیەكانت دەقاودەق دووپات كردۆتەوە. شیعر وەرگێڕان چۆن وا دەبێ؟!
- بۆ نابێ؟ زۆر چاكیش دەبێ. نە هێشتوومە بە قەرا موویەك ماناكەی بگۆڕێ. نە هێشتوومە سەنعەتە بەدیعیەكانی تێك چێ. نە وەزن و قافیەم تێك داوە. ئەسڵی كار فیعلە" فیعلەكانیشم كردۆتە كوردی. دەی لەوە زیاتر چت دەوێ؟ وەڵڵا یەكی دی ئاوای وەرگێڕابا دەیان گوت شاكارە و لەقەبی مامۆستاشیان دەدایە. بەڵام هەر تۆی منت وەبەر چاو نایە.

١٣٧٠

# هونەرمەند

خوێنەرانی هێژا، هونەرمەندێکی لاو هەیە، مانگێك بوو لەبەرم دەپاڕاوە، وت و وێژێکی لەگەڵ بکەم منیش لە ترسی میرزا نەمدەوێرا بچم، چونکە پێی وایە ناتوانم ئەو ئیشانە بێ چاوەدێریی وی بەباشی بەڕێوە بەرم. دەنا بە دڵ پێمخۆش بوو بچم. ئاخر قسەی خۆمان بێ و لە نێومان دەرنەچێ، کاکی هونەرمەند بەڵێنیی دەم شیرنیەکیشی دابوو، خودا هەڵناگرێ قەولەکەشی بردەسەر. جا ئەمڕۆ کە دیتم میرزا سەری قاڵە، دەرفەتم هێنا و چووم ئەو وت و وێژەم لەگەڵ کرد:

- بەڕێز تکایە خۆت بە خوێنەرانی ئێمە بناسێنە.
- بە نێوی خودا، پێش هەموو شت، زۆر سپاسی جەنابی بەڕێزت دەکەم کە بۆ پڕ کردنەوەی کەلێنێکیتر لە فەرهەنگی نەتەوەکەمان، ئەو وت و وێژەت پێك هێنا.

من مەولوودی کوڕی مەسعوودی کوڕی کەریمی کوڕی ڕەحیمی کوڕی سەلیمم، دایکم خات خانزادی کچی پوور پەریزادی نەوەی پوور روحیزادە و ڕۆژی سێ شەممۆ سەعات یەك و سێ و دوو دەقیقەی بەربەیانی، ڕێکەوتی حەوتەمی مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٥٣ی هەتاوی لە دایك بووم. ژمارەی پێناسەکەم ٤١٢، ژمارە لیزگەی پێناسەکەم ١٤٨٠٨٧٢/ ئەلف، وەرگیراو لە ناوچە ١٣ی شاری ...

- باشە لەوانە گەڕێ!
- بەسەر چاو" بەڵێ خوێندنم تا پلەی دووهەمی سەرەتایی درێژە پێدا و ئێستاش خەریکی کاری هونەریم. شایانی باسە بنەماڵەی ئێمە لەوە پێش هەر هونەرپەروەر بووە و دە دوازدە کەڵە هونەرمەندی لێ هەڵکەوتووە. بۆ وێنە مامێکی باپیرەی دایکم، گۆیا شیعر ناسێکی گەورە بووە. بە جورێك کە ئەگەر دوو شیعری کوردی و عەرەبیت نیشان دابا، بە بێ خوێندنەوە، هەر بە دیتنی سەر و ژێری پیتەکان

دەیزانی کامیان کوردی و کامیان عەرەبیە. دیسان بن ئامۆزایەکی باوکیشم کە ئێستا ئەمری خودای بە جێ هێناوە،

- خودا بیبەخشێ.
- لەگەڵ مردووی تۆ" بەڵێ دەمگوت، ئەویش بە زەمانی جحێڵی دەنگی ناخۆش نەبووە و زۆر کەس لە هەرەوەزی دروێنە و جووت، ویرەویریان لێ بیستبوو. جا ئەو دوو هونەرمەندە بەڵگەیەکی پتەون، بۆ سەلماندنی هونەر پەروەر بوونی بنەماڵەی ئێمە" چ لە بەر و چ لە پشت.
- کاک مەولوود، دەکرێ لە بارەی هونەری خۆتەوە بۆمان بدوێی، کە خەریکی چی؟
- وەڵڵاهی ئەوەی راست بێ، هێشتا هیچم نەکردووە. بەڵام بۆ ئەوەی داب و نەریتی بنەماڵەکەمان کوێر نەبێتەوە و خزمەتێکیشم بە ئەدەب و فەرهەنگی نەتەوەکەم کردبێ دەمەوێ لە داهاتوودا شیعر بنووسم و نازناوی (مامۆستا جەحۆ) شم بۆ خۆم هەڵبژاردووە.

١٣٧٠

# قەسیدە

- ئەرێ مەحموود!
- گیانی مەحموود.
- ئەرێ ئەو قەسیدەیەی خوێندتەوە، لە مەدحی سوڵتان مەحموودا نەبوو؟
- کوڕە نەوەڵڵا. ئەوە لە مەدحی خۆمدا بوو ئەحمەد گیان. سوڵتان مەحموودی کوێ!
- هەی نە بێ! جا چۆن ئاخر؟
- ئەی خۆ ئیشەڵڵا درۆت عەرز ناکەم.
- کوڕە شتی چا بڵێ! باشە کێ بۆی نووسیوی؟
- قوربان چت لێ بشارمەوە. ئەوە دوێنێ پازدە قڕانم کرێ تاکسی بـۆ شـاعیرێك دا" ئەویش ئەو قەسیدەیەی پێ هەڵکوتم و بۆی ناردم. حەفتاونۆ بەیتیشە.
- باشە بەیتی چەند کەوتووە؟
- چوار شایی، شتێك کەم.

١٣٧٠

# بانگەواز

بەمجۆرە بە تەواوی خوێنەرانی خۆشەویست رادەگەیەنم، کە لەبەر کەمتەرخەمیی خۆم و لاپەڕ بوونی ماڵ، ماوەی دوو ساڵە قەتحە چیرۆکێکی خشپیلەی نازدارم لێ ئاوەکی بووە و بێ سەر و شوێنە و تا ئێستا نەگەڕاوەتەوە ماڵێ.

شایانی باسە هێندێ کەس (خودا لێیان هەڵنەگرێ) نەخشانەی خراپ لێدەدەن و دەڵێن: هەر نەماوە و لە «گۆڕستان»دا نێژراوە ـ کە ئیشەڵڵا درۆیە.

هێندێکیش دەڵێن: نەخێر ماوە و لە هەندەران دیتراوە کە خێرۆمەندێك زگی پێی سووتاوە و بە خێری خۆی بە خێوی کردووە و (کراسی رەشی گوڵ گوڵی) ی بۆ کڕیوە و لە عەولادی خۆی بە فەرزتر دەزانێ ـ خودا خێری بنووسێ و عەوەزی چاکەی بداتەوە.

جا تکایە ئەو کەسانەی ئەحیانەن بە سەر و سۆراغی دەزانن، ئاخر خۆ کافرستانی نیە، بە خێری دایك و بابیان خانەخوێکەی ئاگادار کەن، تا منەت بارم کا و بە ناردنەوەی، بنەماڵەیەك لە پەژارە و چاوەڕوانی رزگار کا و لە بارتەقایدا بەگەردن ئازایی (مزگێنی)م لێ بستێنێ.

بە سپاسەوە:

میم.رەمەزانی

١٣٧٦

# هاوار

دەگەڵ گرمەی هەوری بەهار، کۆمەڵە چیرۆکی هاوار، بەهاوکاریی خەڵکی چەند شار، لە ژێر چاپ هاتە دەر.

بیناسە:

ناو: هاوار

نووسەر: ناسر وەحیدی / بۆکان

ناشر: محەممەدی / سەقز

چاپخانە: شوعاع / تەورێز

وێنەی رووبەرگ: زیائوددینی / سنە

پیت چن: ئازەر / ورمێ

***

ابر و باد و مه و خورشید و فلک در کارند

تا تو نامی به کف آری و الی آخرها...

شیعر: سەعدی / شیراز

١٣٧٦

# بێ سەوادی

دوێنێ عەسر، بێ خەیاڵ پاڵم دابۆوە و تـەوەژمی خـەیاڵی مامۆسـتا ئاسـۆم بـە دەستەوە بوو و لە شیعرێك! دەگەڕام (ئاخری هەر نەشم دێوە) کە لە پڕدا شەنگەحمەد گۆڤارێك بە دەستەوە، وەك دڵۆپە لێم پەیدا بـوو و وەکـوو جـاران، بـێ لـە دەرکـەدان خۆی بە ژووری داکرد:

- سەلامەلێك.
- عەلێکە سەلام.
- ئەرێ تۆ دەزانی دڵمان بەو تەنیا حەوتەنامەیە خۆش بوو ئەویش بە هیچ دەرچوو!
- بۆ؟ ناکا وتارت بۆ ناردبێ" دووبەش هەڵە و بەشێك راست لەچاپی دابێ؟
- کوڕە نا، ئەو هەڵەش بکا هەر بە راستی(!) دەزانم. قسەی ئەوە نیە.
- ئەی کتێب ناسان دیسان کردوویانەتە ئاڵبۆمی ئەکس؟
- نەو.
- ئەدی ناکا دیسان سەفەرنامەنووسان بە باسی شام و نەهار قرخە بڕیان کردبێ؟
- باسی شام و نەهارت کرد، لێی نزیك بوویەوە بـەڵام نـەتپێکا. کـوڕە چـوون چیان کردووە" زۆر ناشیانە، ئاگاداریی تـەلاری خواردەمـەنیان لـە پـەنا پیرۆزبـایی پلـە و پایەی گەورە پیـاوان لـە چـاپ داوە! جـا تـۆ خـوا ئـەوە کـارە؟ ئـاخر ئـەو دوانـە چ پێوەندیەکیان پێکەوە هەیە؟

***

خوێنەری خۆشەویست ئەحمەد ـ هەر چەند لە هەرتك چاویشم خۆشتر دەوی ـ هەر ئەوەندەی لێ دەزانێ و بە قەولی کابرا هەر سەرێکی لێ حاڵیە! بێ سەوادە ئیتر.

١٣٧٦

# جوامێری

بە درێژایی مێژوو، لە نێو هەموو میللەت و نەتەوەیەكدا پیاوەتی بە باش دانراوە، دەستەواو و هەرەوەز هەربووە و یارمەتی و جوامێری رێزی لێ گیراوە. لە نێو ئێمەی‌كوردیش‌دا، ئەگەر پیاوەتی و یاریدە لە گەلانی دی زیاتر نەبووبێ، بێ گومان كەمتر نەبووە و كۆمەڵناسی لاوەكی و خۆماڵی ئەو راستیەیان سەلماندووە و بۆیان لە مل داوە.

جا هەر بەو پێودانە، ئەو قەدەرە بلیمەتێكی خۆشەویست و شاعیرێكی پایەبەرز و ناسك خەیاڵی كورد، خوا بۆ گەلانی دراوسێی بپارێزێ، دوای پێ گەیاندنی ئەدەب و وێژەی خۆماڵی بە ئەركی سەر شانی خۆی زانیوە، سووكە ئاورێكیش (بێ ئەدەبی نەبێ) وەسەر ئەدەبی فارس بداتەوە و (دوو لە رووی حازریان) دیوانێكیان لە تیراژی چەند هەزاردا بۆ چاپ كا و بەو كارە جوامێرانەیەی، ئەدەبی وانیش بگەیەنێتە ریزی ئەدەبە پێش‌كەوتووەكانی دنیا و بگرە لەوانیشی تێپەرێنێ و نێویان بێنێتە نێو نێوان.

كارەكەی مامۆستای بەرێز و شاعیری ناسك خەیاڵ لە باری مرۆڤایەتیەوە قسەی لەسەر نیە و تا دڵت حەزكا جێی رێزە. بەڵام من لەوە داخم دێتێ كە فارسەكان سپڵە بوون و ئەو جۆرەی پێویستە چاكەی ئەو مامۆستایەیان لە چاودا نەبووە و ئەو رێزەی شیاوێتی لێیان نەگرتووە.

ئاخر ئەگەر لەبەر دەس كورتی پەیكەرەیەكیان لێ ساز نەدەكرد (جا با لە زێر نەبا و لە قەڵاییبا) و لە شوێنێكی شیاو دایان نەدەنا، (جا با تاران نەبا و لە شۆرەكاتی لووت با) دەبوو بە ئەمەگی ئەو چاكەیە لانی‌كەم كتێبە بەنرخەكەی بكەنە سەرپاژی دوو واحیدی دەرسیی زانكۆی وێژە. یا خۆ هەر نەبا داوای جایزەی نۆبێلیان بۆ كردبا، چی تێدەچوو؟

١٣٧٦

# دوور ئەندێش

ئـەو قـەدەرە برادەرێکـی گـەڵێك ئـازیز و هێـژا (مەپرسـن کـێ؟ وا فـەرز کـەن مونتەزیرولوەکالەیەك) لە شارێکی دەور و بەر (مەپرسن کوێ؟ وای دانێن سـەقز یـان هێندێك ئەولاتر) بە بۆنـەی بەشـداریی خـەڵك لـە هەڵبـژاردن، سپاسـنامەیەکی رەش کردۆتـەوە و بـەوی رووی دار و دیـواری سـپی کردۆتـەوە و خـەڵکی بـە ئاوەڵنـاوی «دوورئەندێش» نێودێرکردووە.

ئازیزان ئێمەی کورد پەندێکمان هەیە دەڵێ: هەموو شتێك بە خوێ و خـوێش بـە ئەندازە. فارس دەڵێ: اندازه نگه دار که اندازه نکوست. هـەروەهـا عارەبـان دەڵـێن: خیر الامور اوسگها. بەڵام ئینگلیسیەکان دەڵێن:

**East and west parliament is best.**

هەڵبەت عورووس و فەرهەنگی و کار و باریش لەو بارەیـەوە پەنـد و ئامۆژگاریـان بە پێی فیلانە و ئەگەر نموونەیان لێ ناهێنمەوە، وەنـەبێ لەبـەر نـەزانین بـێ، بـەڵکوو لەبەر ئەوەیە بە رۆژئاوا پەرەستی تاوانبار نەکرێم و مـۆرکی رۆژهـەڵات دۆسـتیم لـێ نەدەن. دەنا جێی خۆی بوو لە حەفتاو دوو میللـەتان نموونـە بێنمـەوە کـە: زێـدەرەوی حەددێکی هەیە، خۆ بەکەم گرتن حودوودێکی هەیە. ئـەو هـەمووە تەوازوعـە لەبـەر چی؟ ئەو خاکینەییە بۆ؟ ئـاخر بـۆ دەبـوو ئـەو بـرادەرە بـەرێزە، ئـەو وشـە پرمانایـە (دوورئەندێش) لە ژێر دەقەکە لە پەنا ئیمزاکەی خۆشیەوە دانەنێ؟ چون بە براوی من و بەوەکالەت لە لایەن خوێنەرانیشەوە ـ هەرچەند وەکالەت وەرگرتن ئێستا هێنـدیش هاسان نیە! ـ ئەو برادەرە هێژایە، بەو داهێنانە جوان و پڕ مانایە، بۆ خۆی لە هەموو کەس «دوورئەندێش» ترە.

١٣٧٦

# نامه بۆ نوێنەر

**برای بەرێزم جەنابی لایەنگر دۆست**

**نوێنەری خۆشەویست و دڵسۆزی شارەکەمان لە مەجلیس**

دوای سڵاو و ڕێزێکی تایبەت، هەر وەکی بۆ خۆشت ئاگاداری، لە کاتی هەڵبژاردندا ئەوەندەم نەڕڕاندبوو کە هیچ شایەرێك لە شایی دەوڵەمەندان ئاوا دەنگی ناکەوێ و ـ دوو لە ڕووی جەنابت ـ وەك کەڵەبابی پاشەڵ چەور کراو، مانگێکیش دوایە، نووزەم دەر نەدەهات. منەتیش ناکەم و بە ئەرکی سەر شانی خۆمی دەزانم. غایەتێکی ئێستا کە داری ئاواتمان هاتۆتە بەر و منداڵە گەورەکانم هەموو کاری شیاوت پێ سپاردوون، عەبەی کوڕم کە پاشەبەرەیە و هێشتا قوتابخانەی ماوە، هیچ کارێکی بە دەست نیە. جا تکایە بۆ ئەوەی دوژمنمان پێ خۆش نەبێ و ناحەز پێمان پێنەکەنێ، دەستوور بفەرمووی هەتا دەرسی تەواو دەبێ، بیکەنە چاوەدێر (مۆبسیر)ی کلاس.

ئیتر سپاس

برات: محە کەساس

١٣٧...

# بزن و کتێب

هەزار رەحمەت لە قەبری قەدیمیان" دە لێن سی چل ساڵ لەوە پێش بە رەحمەت بێ پوور مرۆت، بزنێك دەدا بە دوو تمەن و حوکم لە خوشکەزایەکی دەکا بچێ بەو پوولـە لە بـازار مانگایـەکی تـەڕەزەن و دوو باتمـان قەنـد و گەروانکەیـەك چـای بـۆ بکـڕێ. خوارزاکەی بە تەوەسەوە پێی دەڵێ: ئەی پووری باقیەکەی؟ پـوور مـرۆت دەڵـێ: بـێ بەلاّ بی، خۆ باقیەکەی ناتخوا، لە گیرفانتی نێ و بۆم بێنەوە.

***

پەڕاوێز: خوێنەری خۆشەویست، مەبەست لە نووسینی ئەم سەرگوریشتەیە، تەنیا گێڕانەوەی قسەیەکی خۆش، بۆ زاخاوی مێشك و کرانـەوەی دڵ بـوو و بـەس. ئەگـەر کەسێك پێی وابێ مەنزوورمان لە کتێبەکەی کاك محەممەدی رەمەزانیە کـە محەممـەدیی سەقز لە تیراژی دوو هەزاردا چاپی کردووە و لە پێشەکی‌دا بە جێی دووهـەزار، تـەنیا پێشکەش بە نۆ نەفەرکراوە" هاشاولیللا، گەڵێ بە هەڵەدا چووە و دەیهەوێ عاسمان و رێسمان لێك بەستێ و دڵی وێژەوانان لە ئێمە بێشێنێ. دەنا بزن لە کوێ و کتێـب لـە کوێ!؟

***

پەڕاوێزی پەڕاویز: هێندێك کەس سێ بە سێ تەلاّق فڕێ دەدەن و بـە سـوێندانەوە رەش دەبنەوە و دەڵێن: بە دینی محەممەدی! ئەگەر تیراژی کتێبەکـە چـوارهەزار نـەبێ، لە سێ هەزار بەرگێکی کەم نیە. وەباڵ بەستۆی خۆیان.

١٣٧٧

# عەسری شاعیر

پیاو ئەگەر ریشی سپی نەبوو و چاویلکەی زەڕڕەبینیی لە چاو نەکرد و گۆچانێکی حەیزەرانی ـ جا با بۆ ئیفادەش بێ ـ دەست نەدایە، با شکسپیر و فیردەوسیش بێ، کەس تووی بە کڵاوی ناپێوێ و قسەی دوڕ و گەوهەریش بێ، بە هێندی ناگرن و گوێی نادەنێ.

هەڵبەت من خۆم ناهێنمە ریزەی شکسپیر و فیردەوسی، ئەستەغفیروڵڵا! بەڵام خۆ ئەوەندەم سەر و بنی کتێبیان کردووە کە بزانم، کێش لە شیعردا بە قەد مانا گرینگ نیە و شاعیر نابێ مانا لە پێناو وەزندا بفەوتێنێ و بۆ راست کردنەوەی کێشەکە، چاو لە مانا بنووقێنێ. دیارە کاری وا خەتایە و بگرە خەیانەتیشە. کەچی بە داخەوە مامۆستا «فەرامەرزی» ئەو بنەما گرینگەی لەبەر چاو نەگرتووە و لە شیعرێکی دیوانە سێسەتمەنیەکەیدا (کە هەر سێسەت کەلیمەش دەبێ و هەڵگری راستەقینەی قسە و تمەنە) بۆ ئەوەی وەزنی شیعرەکە تێك نەدا، بە جارێك خۆی لە مانا نەبان کرووە و دەفەرموێ:

*«شاعیر هەورە و*

*شیعر باران*

*ئەم بەهارە پڕ باران وگرمەی هەورە*

*بڵێی سالی نالی نەبێ؟»*

دەجا ئەگەر کێش ئیزنی دابا، منداڵێکیش دەزانێ دەبوو مامۆستا فەرامەرزی ئەو ساڵە، ساڵی شێخ رەزا نێو بنێ، نەك نالی.

# دزی ناشی

ئەو قـەدەرە، مامۆسـتا شـەریفی ملوانکـەی شـین، لـە پـەنا پڕووپاگەنـدەی خـۆ ناساندنی! کاندیداکان و ئاگاداریی سەرەخۆشیی بە رەحمەت چووان!، بانگەوازێکی بە دار و دیواری شارەکاندا بڵاو کردۆتەوە کە گۆیا کتێبەکەیان لێ دزیـوە و بـێ ئیزنـی ئەو لە چاپیان داوەتەوە و بڵاویان کردۆتەوە. بۆ بەڵگەش کوتوویە بـەوەڕا دەزانم، کـە تـەواو نـەیانتوانیوە لاسـای چـاپە ئەسـڵیەکە بکەنـەوە و جیـاوازیی نێـوان چـاپەکان ئاشکرایە. جا داوای کردووە کوڕگـەل قـۆڵی لـێ هـەڵماڵن و ئـەو دزە نامـەردەی پـێ بناسێنن.

هەڵبەت من نە پسپۆڕی کاری چاپەمەنیم و نە لە ناسین و ناساندندا! سەر رشتەم هەیە، بەڵام بۆ دۆزینەوەی دزەکان بەش بە حاڵی خـۆم وەك رێنوێنیـەك ئەوەنـدەم لـە دەس دێ، کە بە پێی بەڵگەی خودی مامۆستا شەریف، ئەوە بڵێم: کە: دزەکان ناشی بوون و لەوەدا هیچ شك و گومانیشم نیە.

١٣٧٧

# Culture

سەد رەحمەت لە قەبری ئەو کەسەی گوتوویە: «نەداریی ماڵی، نەداریی فەرهەنگیی بە دواوەیە». بە راستی وایە و هیچ شك و گومانی تێدا نیە.

هەڵبەت من کارم بەوە نیە فەرهەنگ بە چی دەڵێن و چ شتگەلێك دەگرێتەوە و ئەو باسە با زانایانی فەرهەنگ ناس بیکەن کە باشتری لێ شارەزان. بەڵام ئەوەندە دەزانم کە زمان سەرەکیترین دیاردەی هەر فەرهەنگێکە و ئەگەر زمان لە ناو بچێ وردە وردە دیاردەکانیتریش بەدوویدا ئاوا دەبن و لە زمانە بێگانەکەدا دەتوێنەوە. کە پێموایە لە ناو چوونی زمانیش بە پێی گوتەی کابرای گۆرین، پێوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ نەداری دایە.

بۆ وێنە ئەو کەسانەی لە زمانی خۆیاندا ئەوەندە شارەزا نین! کە فێری منداڵەکانیانی بکەن و زارۆکانیان بە زمانێکی بێگانە رادێنن، ئەگەر ئەوەندەیان دەست رۆیشتبا دیوانێکی حاجی قادر بکڕن (هەڵبەت کۆیی نەك شامی!)، پێتان وانیە هەرگیز تووشی ئەو کۆسپە گەورەیە نەدەبوون؟!

١٣٧٧

# راز

مامۆستا **محەممەد**ی قازی ٢٤ی سەرماوەزی ٧٦ی هەتاوی کۆچی دوایی کرد. (رووبەرگی سروە. ژ ١٣٩)

**٢٤ی بەفرانباری ٧٦ دڵی وەرگێڕی مەزن، محەممەی قازی لە لێدان کەوت.** (ئاویەر. ژ ٢٠)

مامۆستا **محەممەد** قازی لە رۆژەکانی ئاخری رێبەندانی ٧٦، کۆچی دوایی کرد. (ئاوێنە. ژ ٣٦)

لێرەدا لە زانایان، ئەدیبان، وێژەوانان، مێژوونووسان، رۆژنامەوانان، توێژکاران، رۆژهەڵات ناسان، لە رێکخراوە فەرهەنگیەکان، لە بنکە ئەدەبیەکان و خۆلاسەی کەلام لە تەواوی قەڵەم بە دەستانی دڵسۆز و مامۆستایانی کارامە دەگێڕمەوە کە پیاوەتی بکەن و قۆڵی هەوڵ و هیممەت هەڵماڵن و رۆژ و مانگی کۆچی دوایی وەرگێڕی مەزن، مامۆستا **محەممەد**ی قازی، بۆ تۆمار کردن لە مێژوودا روون کەنەوە. چۆن پێمwaیە ئەگەر ئێستا ئەو کارە وەپشت گوێ خرێ و ساڵێك بەسەر کۆچەکەیدا تێپەڕێ، تازە بە ئیفلاتوونی حەکیمیش مێژووی دەقیقی کۆچی دوایی ئەو خوالێخۆشبووە دیاری ناکرێ و ئەوگرێپووچکەیە هەرگیز ناکرێتەوە و هەتا هەتایە وەك رازێك دەمێنێتەوە. هەڵبەت پیاو لە هەق لانەدا، رۆژنامەوانانی بەڕێزی سروە و ئاوێنە و ئاویەر، خودا دەوامی عەمریان بدا، بە هەوڵ و تێکۆشانی بێ وچان و ماندوو نەناسانەیان، بەشێکی گرینگی مەسەلەکەیان روون کردۆتەوە و ساڵەکەیان دیاری کردووە کە بە مەعلوومی ٧٦ی هەتاویە.

١٣٧٧

# کیَبەرکیَ

بەمجۆرم لە تەواوی ئەو کەسانەی عیلمی جەفر و رەمڵ دەزانن و بە ئامێری ئوستورڵاب کاریان کردووە و لە ریازیاتی قەدیمدا شارەزان و کەرەسەی زیج بە باشی بە کار دەبەن داوادەکەم. ئەو رستەیەی خوارەوە کە لە حەوتەنامەیەکی خۆماڵیدا بڵاو بۆتەوە و ـ تازە کۆش نابێتەوە ـ مانا لێدەنەوە و مەبەستی نووسەرەکەیمان بە زمانێکی رێك و رەوان بۆ رەوانەکەن و بۆ خەڵاتەکەشی تەبەکێکمان نان بە قەرز لێ وەرگرن.

رستەی کیَبەرکیَ: «نه مگر آنانی كه اشعار لوركا و شاندرپتوفی و ... را به زبان كردی نمی‌توانند و یا نمی‌خواهند؟ اشعار ژیلا حسینی را نیز به زبان‌هایی كه در آن فقط اشعار و نوشته‌های شاعران و نویسندگان غیر كرد را به زبان كردی ترجمه می‌نمایند مبادرت به این كار كنند.»

رەنگە خوێنەرانی خۆشەویست داوای نێو و نیشانی وتارەکە بکەن و بڵێن تا پاش و پێشی رستەکە مەعلووم نەبێ، نازانن مانای چیە. بەڵام لازم نیە خۆ بۆ دەقی وتارەکە ماندوو کەن. چوون ئەگەر پاش و پێشی! مەعلووم با، نە ئێوەمان تووشی زەحمەت دەکرد و نە ئەو زەرەدەشمان لە خۆمان دەدا.

١٣٧٧

# بەختەوەری

بە بڕوای من دروست نیە برا کوردەکانی باشوور گلەیی لە بەختیان بکەن و خۆیان بە بەدبەخت و چارەڕەش بزانن. چون بەختەوەرترین نەتەوەی دنیان. ئەوە نەبوو کە لە دەست سەددام وە زاڵە هاتبوون، بۆ دەوڵەتێك دەستەو دوعا بوون؟ دەی ئێستا لە سایەی حەمدی خودا و هیممەتی گەورە پیاوانەوە، لە خودای بە زیاد بێ، بە جێی دەوڵەتێك دوو دەوڵەتیان هەیە.

١٣٧٨

# نامه

**برای خۆشەویست ، میستێر جوفلی جێڕ، سەرۆکی بەڕێزی کۆمپانیای ترۆمبیل سازیی جیفرکی سۆئێد.**

وێڕای سڵاو و ڕێز، ماوەی مانگێکە، برادەرێکی کوردمان بە نێوی کاك (حەمەی خولەی کەرێزکەن)، کە گۆیا لە وڵاتی ئێوە پەنا بەرە، بو سەردان هاتۆتەوە کوردستان و ماشێنێکی لە کۆمپانیاکەی ئێوەڕا دەگەڵ خۆی هێناوەتەوە. بەڵام کە ڕۆژانە دە داوزدە سەعاتێك بە شەقامەکاندا مەشقە جاشکەی پێ دەکا، چراکانی بەردەوام پتەپتیانە و ئەو بەستەزمانە بۆی ناکووژێنەوە" کە هێندێك کەس پێیان وایە خودای نەخواستە بۆ فیز و ئیفادە وا دەکا و دوعای بە خێر بۆ کەس و کاری دەنێرن. هێندێکیش دەڵێن: کلاویان لەسەر ناوە و ماشێنی عەیبداریان لە مل پەستاوتووە.

جا ئێستا تۆ قەبرێکی ئەو «ئۆلاڤ پالمە»یەی چۆتێ، بە زەحمەتی مەزانە و سوڕی ئەو کارەمان بۆ روونکەوە، چون ئێمەی ڕۆژهەڵاتی لە سەیری ماشێنی سۆئێدی و باس و خواسی پەنابەرە میوانەکان زیاتر، چ کار و سەر قالییتر شك نابەین.

لە کۆتاییدا لێرەوە هەتا ستۆکهۆڵم، سڵاوی هاوکارەکانت دەگەیەنم و دەست و چاوی ورد و درشتیان ماچ دەکەم.

بە سپاسەوە براتان ئەحمەدە سوور

(نوێنەری بێکارەکانی کوردستان)

٢٠ی حوزێرانی ٢٠٠٤

# وەڵام

**برای خۆشەویست کاك ئەحمەدە سوور، نوێنەری بەرێزی بێکارەکانی کوردستان!**

وێڕای سڵاو و ڕێز نامەکەت گەیشت و لە وەڵامی‌دا دەبێ عـەرزت کـەم کـە لـە بەرژەوەندیی کۆمپانیاکەماندا نیە کڵاو لەسەر کەس بنێین و ماشێنی عەیبداری پێ بفرۆشین" ئەوە یەك. دوامینی ئەوەش ئـەو بـرادەرەی باسـت کـردووە، بـە خـۆی و بـە خێزانیەوە زۆر زەحمەت کێش و بێ ئیفادەن و وێناچێ ئـەو کارەیـان بـۆ فیـز لێـدان و خۆڕانان بێ. چون ئـەو کارانـەی قولەڕەشـەکان دەعێیـان نـاهێنێ بیکـەن، ئـەوان بـە ڕوویەکی خۆشەوە وەك گـوڵ بـەڕێوەی دەبـەن و لێـرە «ئاغـا حەمـە» ئیشـی خـاوێن کردنەوەی ڕەهەندی ئاوەڕۆیە و خێزانی (Baby sitter)ە و پەڕۆ و پاڵی منداڵمان بۆ دەشوا و هێندەمان خۆش دەوێن، زۆر جـار بـۆ دەس خۆشـانە جلـە کـۆنی خۆمانیـان دەدەینێ لەبەری دەکەن.

جا بەو پێیە هۆی پتەپتی چرای ترۆمبیلەکە، نە عـەیبی کۆمپانیـایـە و نـە فیـز وئیفادەی خاوەنی. بەڵکوو وێدەچێ هۆی لێ نەزانینی ئاغا حەمە بێ، ئاخر پیـاو لـە ڕەهەندی ئـاوەڕۆدا خـۆ دەرسـی ئەلـەکترۆمکانیك فێـر نـابێ! دەی ئـەو بەسـتەزمانە گوناحی چیە؟

لە کۆتاییدا منیش دەمەوێ ئەو گلەییەتان لێ بکەم کە ئێوە بۆ ئەوەندە نەتەوە پەرەستن و ئەوی بە ڕاڕەوی تووشی بوون بە زۆری دەیکەن بە کورد؟! خۆ ئەو بەڕێزەی باست کردووە لە لای ئێمە دەڵێ فارسم و لـە تـاران لـە دایـك بـووم. تەنانـەت دەڵـێ یەکێك لە شازادەکانی قەجەر مامانم بووە و نێوکی بڕیوم.

بە سپاسەوە براتان جوفلی جێڕ

(سەرۆکی کۆمپانیای جیفرکی سۆئێد)

٢٤ی ئووتی ٢٠٠٤

# قسەکەت بە شەکر دەبڕم

(گاڵتە لەگەڵ نووسەران)

- جەلال مەلەکشا: چەند کەڵە شاعیری فارس بە نێوی شاعیر و نووسەرێکی سەرکەوتوو پەسندیان کردبووم. بەو حاڵەشەوە کە رووم لە ئەدەبیاتی کوردی کردووە، پەژیوان نیم.

o خەیلیێ مەمنوون.

- *محەممەد* حەمە باقی: (ناپلیۆن بە گۆتە) : هەتا لێرەن، ئەبێ هەموو شەوێ بچنە دیتنی شانۆنامەکانی لای ئێمە، پێشتان خراپ نابێ پیادەکردنی هەندێ لە شێوەن نامە باشەکانی فەڕەنسایی ببینن.

o یەکێك لە بەڵگەکانی بلیمەتیی گۆتە، حاڵی بوون لەو فەرمایشتەی جەنابی ناپلیۆنە.

- لەتیف هەڵمەت: فارسیەکەم ئەوەندە قەوی نیە ...

o کە لەو شیعرەی نیزامیی دایك براماں حاڵی بم:

لاف از سخن چو دُر توان زد        آن خشت بود کە پُر توان زد

- مستەفا ئێلخانیزادە: وەك من لە شیعرەکانی جەنابتان (لەتیف هەڵمەت) تێگەیشتبێتم.

o جا ئەگەر تۆ لە شیعرەکانی نەگەی، کێ تێیدەگا؟ ئەی نەتبیستووە دەڵێن: شاعیرێ کە شاعیرێ دەبینێ، خۆشی لە شیعرەکانی دێ.

# تذکرة الاصدقاء

آن شیفته‌ی پست و ریاست، آن دایره‌ی حسن و لیاقت، آن طالب تمامی، آن در تلّون قدامی، مولانا شیخ خیرالله غلامی ـ کثر الله امثاله[1]– از اجلّه‌ی [2] روزگار بود و امثال او بسیار بود.

گویند در تهور چونان حسام برّان بود و برای دایره‌ی خویش جناح طیران بود. و در خدمت به قاطبه‌ی پله‌دار بی‌قرار بود و بدان پایدار بود و در فن فصاحت سرآمد روزگار بود و اگر به وقت تکلم تپق زدی، برای دفع چشم زخم بود و لاغیر.

نقل است که موعد ایشان نیک ناموثوق بود، چه مولد ایشان به قرب سوق بود و در خبر است: شر البلدان اسواقها.

نقل است که یک بار وی را گفتند: از چه مدام بند ازار بالا کشی و دست بر سر؟ گفت: تا خاطر آسوده آید از به پا بودن آن و به جا بودن این و بدین صلابت اجابت نشده است مر هیچ احد الناسی را از خلایق الی یومنا هذا.

نقل است که سخت مآل اندیش بود و یک بار به صلاح یکصد و هشتاد درجه دَوَران کرد. سبب جستند، گفت: زاویه‌ی صد و هشتاد درجه خطّ راست کند و این تنها راستی بود که از وی حادث شد.

نقل است که معایب بسیار داشت و از محاسن ته ریشی.

نقل است که گفت: »خیار سبز است و ماست سپید و آب ارغوانی و هر آن کس که زبان دهد، نان دهد.» و این همه از علوم لدنی وی بود که تا بود ـ غفر الله ذنوبه ـ احدی وی را به مکتب ندیده بود.

گویند همو به وقت توکیل، چهل شب تمام نخفتی و نخوردی ـ از خانه‌ی‌خود ـ و مدام دست به دعا برداشتی که: خدایا؛ فلان را وکالت و مرا سمتی عطا...... و چون به عطای سمت رسید؛ ادای فعل مثبت فراموش کرد و شایع است این نسیان، از فرط هیجان و خوش‌خوشان بود، و بعضی گویند از قلّت ادب. والله اعلم.

پس به جهة ریاضة مذکور دعایش مستجاب افتاد و شد آنچه شد؛ چه او از خواص مستجاب الدعوه بود و در فعل خود اسوه.

نقل است که در آن حال وی را پرسیدند: اگر بر مولایت هزیمت افتد چه کنی؟ گفت: .I'll change my line که او .... [۳] مردی بود، نیک کار کشته از احبار و به هر دو زبان سخت مسلط و همی‌دانست چه گونه نان توان خوردن به وقت. پس به سبب حب‌الاثنین فوق‌الاشعار، دائم و قائم در حلقه‌ی درویشان مجتهد بود و آویزه‌ی خویشان مستعد، تا خدایش[۴] به هر دو غنی گردانید.

تابستان ۱۳۷۳

تعلیقات: ـــــــــــــــــــ

۱. در بعضی نسخ کلمه‌ی(کثر) با سین آمده؛ لابد ناسخ بی‌سواد بوده است.
۲. لطفاً لام باهره در لغت (اجله) با غنه تلفظ نشود و الا غلط می‌باشد.
۳. در نسخه‌ی اصل کمینه لغتی بود که نیک با دید نیامد، شاید پیشوندی بوده باشد.
٤. در بعضی نسخ مولایش ثبت شده است.